ناوی کتێب: قاوشی ژمارە (٦)
بابەت: ڕۆمان
پاچڤەی: حەمە کەریم عارف
پیت چنین: رزگار حەساری
هەڵەچن:سەرگوڵ محەمەد ئەمین
مونتاژ: یانەی قەڵەم
چاپ: یەکەم– سلێمانی ٢٠١٣
چاپخانە: یاد
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٢٠٦٨)ی ساڵی ٢٠١٣ پێ دراوە.

پێڕست

**تولستۆی دەڵێت:**

**"چیرۆک و شانۆنامەکانی چیخۆف لە جوملەی ئەو کارە دەگمەنانەن کە ئینسان حەز دەکات دووبارە بیانخوێنێتەوە."**

# پێشەکی

## حەمەکەریم عارف

باوەگەورەی چیخۆف(١٨٦٠-١٩٠٤) بابایەکی کۆیلە بوو. بەڵام کۆیلایەتی هەرگیز قەدەرو چارەنووس نەبووە، بۆیە باپیرەی چیخۆف توانی بە بەهای (٣٥٠٠) رۆبلٚ خۆی و خێزانەکەی بکڕێتەوەو ئازادی خۆی وەربگرێتەوە.

بابی چیخۆف موغازەدارێکی مام ناوەندی بوو، لە ساڵی ١٨٧٦دا نابووت بوو، بۆیە بەماڵ و منداڵەوە باریان کرد بۆ مۆسکۆ، بەڵام چیخۆف کە هێشتا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو نەکردبوو، ناچار لە زێدی خۆی، لە تاگانروگی باکوری قەفقازدا مایەوە. ئەوە بوو بەدەم کارکردنەوە، لە ساڵی ١٨٧٩دا ئامادەیی تەواوکردو چوو بۆ مۆسکۆ، لە پایزی ئەو ساڵەدا چووە زانستگەی مۆسکۆ و لە بواری پزیشکیدا کەوتە خوێندن و هەر لەو سەرو بەندەدا ناو بەناو و لە کاتی دەست بەتاڵیدا کورتە چیرۆکی کۆمیدی دەنووسی و بۆ گۆڤارو بڵاوکراوەکانی دەنارد. هەر چەند ئەم چیرۆکانە لە ئاستێکی هونەری ئەوتۆدا نەبوون، بەڵام چیخۆف بۆ پارەی دەنووسین و لەو رێگەیەوە هەندێ ئەرك و باری سەرشانی خێزانەکەیانی سووك دەکرد بەهەر حالٚ چیخۆف پاش ئەوەی کۆلیژی پزیشکی تەواو کرد، لە شارۆچکەیەکی بچووکدا بە یاریدەدەری پزیشك دامەزرا. لەوێندەر توانی لە نزیکەوە ئەو جووتیارانە ببینێ و بناسێت کە بۆ نەخۆشی و دەرمان هاتوچۆیان دەکرد. هەروەها شارەزایی لە مجێزو تەبیعەتی ئەفسەران و سەربازاندا پەیداکرد" (چونکە لقێکی تۆپخانە لەو شارەدا هەبوو). و هەندێك لەو سوپاییانە لە بەرهەمی (سێ خوشك)دا بەدی دەکرێن. دیارە چیخۆف ئەو کەسایەتیانەی وەکو خۆیان بۆ ناو چیرۆك نەدەگواستەوە. بەڵکو سەر لەنوێ و بە نەفەسێکی هونەرییانە دەیخوڵقاندنەوە. چیخۆف لە سەرەتادا بەناوی خوازراوەوە بەرهەمی گاڵتەئامێزی بڵاودەکردەوە، حەزیدەکرد بەرهەمە پزیشکییەکانی بەناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بڵاوبکاتەوە. هەڵبەتە بەرهەمە گاڵتە ئامێزەکانی لە رۆژنامەو بلاڤۆکانی جۆراو جۆردا بڵاودەکردەوە. زۆربەی ئەو رۆژنامەو بلاڤۆکانە هی گروپ و لایەنێن هەڤڕك و نەیاری یەکدی بوون. گەرچی ئەو بەرهەمانەی کە چیخۆف بۆ پارە دەینووسین و بڵاوی دەکردنەوە زۆرن، بەڵام سەرەتای دەستپێکردنی ڕاستەقینەی نووسین لەلای ئەو بۆ ساڵی ١٨٨٦ دەگەڕێتەوە و لەو ساڵەدا نووسینی کرد بەپیشە.

لە ساڵانی ١٨٨٦ - ١٨٨٧دا یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی چاپو بڵاوکردەوە. ئیدی بەرە بەرە شۆرەتی پەیدا کردو رێگەی بڵاوکردنەوەی بۆ خۆش بوو.دەیتوانی لە باشترین رۆژنامەو بلاڤۆکانداو بەو پەڕی بێمنەتی بەرهەم و چیرۆکەکانی بڵاوبکاتەوە. ئەشقی نووسین بە جۆری لە کەللەی ئەم پیاوەی دا کە بەتەواوەتی خۆی بۆ تەرخان کرد. هەر لەم رێگەیەوە توانی زەوییەکی بچووك لە نزیکی مۆسکۆ بکڕێ، کە هەموو خێزانەکەیانی دەژیاند. خۆشترین قۆناغی تەمەنی ئەو

ساڵانە بوو کە لەوێندەر قەتاندی. ئەم پیاوە زۆر ئاشقی باخ و باخداری و کاری باخەوانی بوو. دەیویست هەموو دنیا بکات بەدارو درەخت. جیهان لە هەموو لایەکەوە سەوز بچێتەوەو ژیانی لێوە هەڵبقوڵێ. هەمیشە هەوڵیدەدا شتێکی تازە بخوڵقێنێ و خۆی کاوێژ نەکاتەوە.. چیخۆف زۆری دڵ بە دنیاوە بوو، ژیانی خۆشدەویست، بە جۆشو خرۆشێکی لەبن نەهاتووەوە مامەڵەی لە تەکدا دەکرد. کەچی وێڕای ئەمەش خۆی بۆ گۆڕینی ژیان تەرخانکرد، واتە کەسێکی هەمیشە نوێخواز بوو.

چیخۆف لە ژیانی رۆژانەیدا پیاوێکی چاکە خوازو چاکە کارو دڵسۆزو میرەبان بوو. هەموو ئەم خەسێت و خەسڵەتانە لە بەرهەمەکانیداو بە شێوەیەکی هونەری ڕەنگیان داوەتەوە و دەشێت کۆی بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکانی بە ئەنسکلوپدیای روسیای ساڵانی ١٨٨٠ – ١٨٩٠ لە قەڵەم بدرێ.

چیخۆف چونکە کەسێکی فرە بەهرە بوو، هەر لە بازنەی چیرۆك و تەنزدا قەتیس نەماو ماوەیەکی باشیش خووی دایە شانۆ نامەو زۆر شانۆنامەی نووسی لەوانە: (هەتیو ١٨٧٧، ئیڤانۆف ١٨٨٧، لالۆڤانیا ١٨٠٢، مەلی دەریایی ١٨٨٦، سێ خوشك ١٨٩٩و... هتد).

زۆربەی شانۆنامەکانی لە لایەن دەزگای هونەری مۆسکۆوە کە لە لایەن ستانسلافسکی و نەمیروفیچەوە لە ساڵی ١٨٩٨دا دامەزرا بوو، نمایش کران و شۆرەتی زیاتریان هەم بە دەزگا هونەرییەکە داو هەم بە چیخۆف.. ئەوە بوو (مەلی دەریایی) لە لایەن ستانسلافسکی و دانچنکو وە هاتە دەرهێنان و نمایش کردن و سەرکەوتنی چاکی بە دەست هێنا.

چیخۆف لە پایزی ساڵی ١٨٧٣دا کە لە سەردانێکی ماڵی باپیری، کە لە دەرێی مۆسکۆ بوو دەگەڕایەوە، لەپڕ خولیاو کەڵکەڵەی شانۆی کەوتەسەر. بۆ یەکەمجار شانۆی شارەوانی، کە سەدان جار بە بەردەمیدا رەت بوو بوو، سەرنجی ڕاکێشاو ئیدی لەوە بەدواوە ئولفەتی دەگەڵ شانۆدا پەیداکردو بەجۆرێ ئاشقی بوو، کە چوونە شانۆ بۆ قوتابی سانەوی قەدەغەبوو، دەچوو جلك و پاڵتۆی بابی لەبەردەکرد و عەینەکێکی شینی لەچاو دەکرد تا لە تەمەنی خۆی گەورەتر بنوێنێ و ڕێگەی چوونە ژوورەوەی بدەن. لەگەڵ خوشك و براکانیا ((٥ براو خوشکێك بوون))تیپێکی بۆ خۆی دامەزراندو لەبەر چاوی کەسوکارو دەرو دراوسێکانیاندا نمایشیان دەکردو هەرجارەی دەوری کەسایەتییەکی دەگێڕا و دەبووە مایەی پێکەنانەدنی بینەران و بەگوتەی ئاندریە دروسی هاوڕێی منداڵی چیخۆف، کە بۆخۆی پاشان بوو بە ئەکتەر، چیخۆف زۆر بەجوانی دەورەکانی دەگێڕا.

ئیدی چیخۆف لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنە منداڵانەیەوە، زاتی پەیداکردو کەوتە پێشکەشکردنی هەندێ بابەتی کۆمیدی کە بەخۆی دەینووسین. لەم کارانەیدا گاڵتەو تەوسی بە عەیب و عاری هاووڵاتیانی خۆی دەکرد. هەڵبەتە هیچ یەکێك لەو دەقانە بەردەست نەکەوتوون، چونکە دوای پێشکەشکردنیان چیخۆف بەخۆی دەیدڕین.

گوتمان چیخۆف کە لە سەفەرەکەی دەرێی مۆسکۆ گەڕایەوە کوتوپڕ رووی کردە دنیای شانۆ. بۆ زستانەکەی بەوپەڕی خوێن گەرمییەوە شانۆ نامەیەکی دوورو درێژی شپرزەی چوار پەردەیی بێ ناونیشانی نووسی.. پاش ئەوەی میشالی برای وێنەیەکی لەبەرگرتەوە، بەخۆی بردی بۆلای ئەکتەری نێودار خات ماری ئارمولوڤا، ئەویش شانۆنامەکەی رەفزکرد. ئیدی چیخۆف لە داخا

دەستخەتەکەی فەوتاند. ئیدی ئەم شانۆنامەیە ون بوو تا لە ساڵی ١٩٢٠دا، یەکەم دەستخەتی لەنێو بەڵگەنامەکانی چیخۆفدا دۆزرایەوەو بەناوونیشانی (پلاتونوف) بڵاوکرایەوە..

ئیدی ئەوە بوو ئەم شانۆنامەیە بە ئامادەکراوی لە فەرەنسادا و بەناوی (پلاتونوف شێت) و بەناوی جۆراوجۆری ترەوە لە ئەڵمانیا و ئەمریکادا پێشکەش کراو بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٩ لە یەکێتی سۆڤیەت پێشکەشکرا.

دیارە رەفزکردنی شانۆنامەکە لە لایەن ماری ئارمولوڤای سەر بە شانۆی مالییی، کردییە کارێك چیخۆف بۆ ماوەیەك لە شانۆ دوور بکەوێتەوەو روو لە رۆژنامە هەجوکارەکان بکات.

چیخۆف وێڕای بەهرەداری و وردبینی و زەینڕوونی و فرە بەرهەمی، نەیتوانی رۆمانێکی درێژی سەرکەوتوو بنووسێت" پێدەچێت نەیتوانیبێ ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵ بابەتەکاندا بژی و بەروونی لەبەر چاوی خۆی بەرجەستەیان بکات و پاشان لە قاڵبی ڕۆماندا بیانهونەرێنێت. هەر ئەوەندە لەگەڵ بابەتاکاندا ژیاوە کە بیانکات بە هەوێنی کورتە چیرۆك و هونەرمەندانە بیانخوڵقێنێتەوە. هەڵبەتە تواناو بەهرەی چیخۆف لە بواری شانۆنامەشدا، هەر لە ئاستی تواناو بەهرەی چیرۆکنووسیدایە..چیخۆفیان لەگەڵ موپاسانی نووسەری پلە دووەمی فەرەنسیدا بەراوردکردووە، ئەگەرچی ئەم بەراوردە لەباری هونەرییەوە زۆر زەرەری چیخۆفە، بەڵام هەندێ لێکچوونیان لەنێواندا هەیە.

یەکێك لەو لێکچوونانە نەفەسکورتی بوو.. هەرگاڤێ موپاسان زۆری لە قەڵەمەکەی کردبێ کە لە توانای خۆی هێوەتر بڕوات، ئەوا رۆمانانی وەکو (دۆستی ئازیز)و یان (ژیانی ئافرەتێکی) نووسیوە، کە چەند خاتری بگری ئەوا دەکەنە کۆمەڵێك کورتە چیرۆك و بە تۆبزی دراونەتە دەم یەکتر و شێوەو نێوەڕۆك و کاریگەری ئاسایی رۆماننووسانی خۆڕسکی وەکو فلوبیرو تولستوی وەرنەگرتووە، چیخۆف یەکجار نەبێ ئەویش لە گەنجیدا، ئیدی ئەو هەڵەیەی نەکردووە کە کتێبی قەبەو ئەستور بنووسێت، درێژترین بەرهەمی چیخۆف کە (دوئێل) یان (سێ ساڵ)ە، نەبوون بە رۆمان و لە خانەی چیرۆکی کورت دان.

* * *

گوتمان چیخۆف چوار براو خوشکێکی هەبوو. ئەلکسەندەرو نیکولای برای کە لەو گەورەتر بوون، تۆران و ماڵیان بەجێهێشت. ئەمە چیخۆڤ زۆر خەمبار کرد، چونکە براکانی زۆر خۆشدەویست. بابیشی هێندەی دی گوشاری خستەسەر ، جا بۆ ئەوەی خۆی لەم وەزع و حاڵ و نیگەرانییە بدزێتەوە کەوتە دەرکردنی رۆژنامەیەکی دەستخەتی یەك نوسخەیی بەناوی (اللجلاج) زۆر بە گەرمی باسی هەندێ دیمەنی ناو ژیانی رۆژانەی گانروگی تێدا دەکرد. رۆژنامەیەکی یەجگار سەرکەوتوو بوو. قوتابییانی قوتابخانەکەی بە تاسەو پەرۆشەوە چاوەڕوانی هەر ژمارەیەکیان دەکرد. پاش ئەوەی لە قوتابخانەدا دەستاو دەستی دەکرد، دەنێردرا بۆ مۆسکۆ تا ئەلکسەندەرو نیکۆلای برا گەورەی چیخۆف تەمەشای بکەن، ئەلکسەندەر نامەیەکی لەمەڕ ژمارەی مانگی ئەیلول بۆ کەسوکاری نارد: ((بە نووسەری اللجلاج بڵێن رۆژنامۆکەکەی وەکو جاران مایەی سەرنج نییە. خوێی کەمە)) ئەم هەڵسەنگاندنە توندە وایکرد کە چیخۆف چیتر لەسەر چالاکی رۆژنامەوانی بەردەوام نەبێ.

چیخۆف کە چووە زانستگەو لە کۆلیژی پزیشکی وەرگیرا، کەوتە ناردنی هەندێ چیرۆکی

کۆمیدی بۆ گۆڤاره ساتیرەکان. دیاره پتر مەبەستی پاره پەیداکردن بوو تا پەروەردەکردنی بەهرەی نووسین.. جا ئەم چیرۆکانە دەبوایە بەپێی داوای سەرنووسەرەکان بوایە، کورت و کۆمیدی، حیکایەتی خێراو بابەتی رۆژ بوایە. پاش ئەوەی چەندین چیرۆکی رەفزکرا، رۆژێك لە گۆڤاری ((سیسرکەی))ی هەفتانەدا، لە ۱۳ /ك۲/ ۱۸۸۰دا لە گۆشەی پۆستەی خوێنەران دا و لەو وەڵامانەدا کە ئاراستەی نووسەرانی تازەکار دەکرێن، ئەم نامەیەی ئاراستەکرا بوو: ((خراپ نییە، ئەوەی بۆت ناردبووین بۆتی بڵاودەکەینەوە، هیوادارین کاری داهاتووت باشتر بێ.)) و پاش ماوەیەکی کەم نامەیەکی لە ئیدارەی گۆڤارەکەوە پێگەیی و ئاگادار کرایەوە کە لە بری هەر دێڕێك پێنج کۆبیکی دەدەنێ. بەڵام پاش دوو هەیڤان ئەوجا چیرۆکەکەی بەناوی ((نامەیەك لە ستیفان فلادیمیر. ن، خاوەنی دون، بۆ دکتۆر فردریکی دانای دراوسێی))و بەناوی خوازراوی (۷ڤ) بڵاو بووەوە.

چیخۆف هێندەی دەستکەوتی دارایی مەبەست بوو بۆ باربووی خێزانەکەی، ئەوەندە مەبەستی نێوبانگی ئەدەبی نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەرکەوتنە کەم نەبوو. بۆیە بەو بۆنەیەوە بە یەکەم پارەی چیرۆك، کێکێکی کڕی و هەموو خێزانەکە ئاهەنگیان گێڕا.. چیخۆف کە خەونی بە دکتۆری یەوە دەبینی، چ گومانێکی لەلا نەما کە پیشەی راستەقینەی (کە نووسین بوو) لەو رۆژەوەو لە تەمەنی ۲۰ساڵی یەوە دەستی پێکرد.

پێموایە کارێکی نابەجێ نابێ گەر لایەك لە مەسەلەی دکتۆرییەکەی چیخۆف بکەینەوە. بابی چیخۆف لە ساڵی ۱۸۷٤دا، خانوویەکی تازەی دروستکرد، ئەم خانووە هەرچی پارەیەکی دەبێ دەیخوات و ناچار دەبێت بری ۵۰۰ ڕۆبڵ لە کۆمپانیای دابینکردن قەرزبکات.. بۆیە ناچار بەشێك لە ماڵەکەی بەکرێ دەدات بە فەرمانبەرێکی دادگای بازرگانی کە ناوی گابرییل یارفانتیڤتش سیلیڤانوڤ دەبێ.. لە ساڵی ۱۸۷٥دا چیخۆف دەعوەتی ماڵی برایەکەی سیلیڤانوڤ ،کە ماڵیان لە لادێ دەبێ، دەکرێ. چیخۆف لە رێگە لادەدا تا لە رووبارێکی بەستەڵەکدا مەلەبکات، ئیدی نەخۆش دەکەوێت و بە پەلە بۆ تاگانروگی دێننەوە پاشان هەر لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەوە تووشی مایەسیری دەبێت و تا مردیش هەر پێوەی ناڵی. دکتۆرێك بەناوی سترامف زۆر بەسۆزو میهرەبانییەوە سەرپەرشتی دەکات، بۆیە چیخۆف لە خۆشەویستی و دڵسۆزی ئەو دکتۆرە لێدەبڕێ ببێ بە دکتۆر و خەڵکانی نەخۆش و داماوی وەکو خۆی چارەسەر بکات.

گوتمان چیخۆف بە بۆنەی یەکەم چیرۆکی یەوە بە کێکێك دەعوتی کەسوکارەکەی خۆی کرد و ئیدی بە تەواوەتی کەڵکەڵەی نووسەریی لەلا دروست بوو، و لەم سەرکەوتنە بەدواوە بەشێکی تەواوی وەختی خۆی بۆ نووسین تەرخانکرد، بەڵام دەبوایە داوای سەرنووسەران جێبەجێبکات و چونکە ئەم بابەتە نووسینە کورت و کۆمیدیانە پادداشتیان کەم بوو، بۆیە دەبوایە زۆریان لێ بڵاوبکاتەوە تا بژێوی بۆ کەسوکارەکەی دابین بکات. چیخۆف پەیتا پەیتا دەقەکانی بۆ گۆڤاری (سیسرك) دەناردو بەنیگەرانییەوە چاوەنۆڕی دەکرد.

لە ساڵی ۱۸۸۰دا نۆ دەق و لە ساڵی ۱۸۸۱دا سیانزە دەقی بڵاوکردەوە. ژمارەی ئەو چیرۆك و گوتارو ریپۆرتاژانەی کە لە ساڵی ۱۸۸۳دا بڵاوی کردنەوە گەییە (۱۲۹) نووسین. هەموو ئەم بەرهەمانەی بەناوی خوازراوەوە بڵاودەکردەوە و چەند ناوێکی خوازراوی بۆ خۆی دانابوو لەوانە: (پیاوی بێ سپڵ، برای برام، عولیس، ئەنتوشا)و زۆر جار بەناوی (ئەنتوشا

چیخۆنتی)یەوە شتی بڵاودەکردەوە، ئەمەی دواییان ئەو ناوە بوو کە پۆکروفسکی مامۆستای لێی نابوو..

پوکرۆفسکی، مامۆستای مێژووی ئاین، بۆ یەکەمجار تواناو بەهرەی ساتیرو تەوسبازی لەلای چیخۆف دۆزییەوەو ئامۆژگاری کرد کە بەرهەمی مۆلێرو سویفت و شچدرین بخوێنێتەوە... چیخۆف هەر بە تەبیعەت گاڵتەبازو شۆخ بوو، ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ڕەفتاری توندی بابی لەگەڵ منداڵەکانیدا. جا بۆ ئەوەی تووشی نا ئومێدی نەبن، پەنایان وەبەر پێکەنین و سوعبەتان دەبرد..

جارێك هەر بۆ کەیف وخۆشی و بە سوعبەت خۆی لە مامی دەگۆڕێ و لە شێوەی سواڵکەرێك دا دەچێتە بەردەمی و میترۆفانی مامی هێندە بەزەیی بەسەرو سیمای خەمباریدا دێتەوە، سێ کۆبیکانی دەداتێ و ئەمە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دەبێ بە نوکتەی سەر زاری کەسوکاری خۆیان.

* * *

جا گۆڤاری (سیسرکە) زۆر جار غەدری لەم نووسەرە لاوە دەکرد، کۆمەڵێك نووسینی ڕەفزکرد، زۆر جاریش لە پۆستەی خوێنەرانەوە وەڵامی توندو ڕەقیان دەدایەوە، وەك: ((وڕینەی کرچ و کاڵ لە سێبەری چەند وشەیەکی بریقەداردا ناشاردرێتەوە.)) یان: ((ئەم سەرە قەڵەمانە بڵاوناکەینەوە. بۆ ئێمە نین، بێگومان بۆ گۆڤارێکی ترت نوسیون.)) چیخۆف لە کۆتایی ساڵی ١٨٨٠دا دوا بەرهەمی بۆ (سیسرکە) ناردو بەمجۆرە وەڵامیان دایەوە: ((تۆ گەشەناکەی، تۆ سیس دەبیەوە. بەڕاستی مایەی داخە، لە ڕاستیدا مرۆڤ ئەگەر هەستی ڕەخنەگرانەی خۆی دەرهەق بە بەرهەمی خۆی نەخاتە کار، ناتوانێ بنووسێت.)).

چیخۆف دڵی شکا و لێبڕا کە چیتر بەرهەم بۆ دەستەی بەڕێوەبەری، لە خۆبایی گۆڤاری سیسرکە نەنێرێ.. هەڵبەتە (سویمونوف) کە یەکێك بوو لە یاریدەدەرەکانی گۆڤاری نێوبراو ئەمەی زۆر لەبەرگران بوو، گوتی: (( دەستەی بەڕێوەبەری گەوجی سیسرکە دەقێکی ئانتوشا چیخۆنتی ڕەفزکرد کە تا ئەمڕۆکە، شتێکی هاوتای ئەو دەقەی بەسەر لاپەڕەکانی خۆیەوە نەدیووە.)).

ئەوە بوو چیخۆف لەگەڵ هەدوو گۆڤاری هەفتانەی (زەنگی بەیانی) و (تەماشاڤان)دا ڕێککەوت کە یەکی (٦) کۆبیکیان لە بری هەر دێڕێك دەدایێ.. لە ساڵی ١٨٨٢داو لە ئەنجامی گرەو لەگەڵ سەرنووسەری (زەنگی بەیانی)دا ڕۆمانێکی بەنێوی (سەرکەوتنی بێهودە) بە هەشت ئەڵقەی یەك لەدوای یەکدا لە گۆڤاری نێو براودا بڵاوکردەوە و سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا.

چیخۆف بەرە بەرە کەوتە بیری ئەوەی کە پشت بکاتە گۆڤارو ڕۆژنامە ناوچەییەکان کە هەم پارەی کەمیان دەداو هەم لە دەڤەرێکی تەنگدا بڵاودەبوونەوە. بۆیە لێبڕا رووبکاتە دنیای بەرینی ڕۆژنامەوانی و لە ڕۆژنامەو گۆڤارە فرە تیراژەکاندا بەرهەم بڵاوبکاتەوە، چونکە پێی وابوو پادداشتی زیاترو مسۆگەرتر دەدەن بەنووسەر.

بەدەم ئەم بیرو خەیاڵانەوە، ڕۆژێکی ساردی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٢ لەگەڵ ئەلکسندەری برایدا بەشەقامەکانی مۆسکۆدا پیاسەی دەکرد، لەپڕ لیکینی سەرنووسەری گۆڤاری هەفتانەی بەناوبانگی (تەلزمە)ی لێ پەیدابوو، لە عەرەبانە هاتەخوارێ و چوون لە باڕێکدا دانیشتن،

سەرنووسەری (تەلزمە) گوتی: پێویستی بە چیرۆکی کورتی کۆمیدی هەیە، بەڵام نابێ دەزگای سانسۆر تورە بکات. نابێ خوێنەر دژی بارودۆخی نالەباری باو هانبدات. لە بری هەر دێرە نووسینێکیش هەشت کۆبیك دەدەن.

چیخۆف شەرتی خۆی بردەسەر، یەکەم نووسینی بۆ ناردن،وەڵامی گۆڤارەکە ئەمە بوو کە ((بەداخەوە زۆر درێژە بە کورتی بنووسە، و پادداشتی باشترت دەدرێتێ.)).. چیخۆف کۆڵی نەدا، لە٢٠ /ت٢/ ١٨٨٢ کۆمەڵە بەرهەمێکی دیکەی ناردو ئەمجارەیان نووسینەکانی بە ئیمزای چیخۆتی لە ستونەکانی (تەلزمە)دا دەخوێنرایەوە.

* * *

چیخۆف هەرچەندە خۆی بە نووسەرێکی زۆر بچووك دەزانیێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزیدەکرد باشترین کۆمەڵە چیرۆکی خۆی چاپ بکات، ئەوەبوو شەش چیرۆکی هەڵبژاردو لەسەر ئەرکی خۆی کە بایی ٦٠ شەست کۆبیك بوو، بە قەوارەی کتێبێکی ٩٦ لاپەڕەیی بڵاوکردەوە.

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە، ژمارەیەکی زۆر کەمی لێهاتە فرۆشتن و ئەوی تری درایەوە بەسەر ساحێبیدا. دیارە ئەم کۆمەڵە چیرۆکە ناوی چیخۆنتی لەسەر بوو. بەڵام ئەم ناکامییە ئەدەبی و بازرگانییە بەوە پڕ بووەوە کە چیخۆف دوا تاقیکردنەوەکانی دوا ساڵی زانکۆی پزیشکی تەواو کردو، بوو بە دکتۆر (٢٥/٦/١٨٨٤).

ئیدی چیخۆف بەدەم کاری دکتۆرییەوە، کاری نووسینیشی دەکرد. لەنێوان ساڵانی ١٨٨٠ – ١٨٨٤داو بەناوی خوازراوی جۆراو جۆرەوە سێسەد دەقی لە گۆڤارە جیاوازەکانی مۆسکۆ و سان پترسبۆرگدا بڵاوکردەوە. دیارە لە نێو ئەم هەموو نووسینە کۆمیدیانەدا، هەندێ چیرۆکی زۆر باشیش هەبوون. چیخۆف هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی بە شێوازێکی سادەی بێ پەردەو گرێ و گۆڵ بنووسێت و وا لە خوێنەربکات، نووسەر لە بیربکات و لەگەڵ قارەمانانی ناو چیرۆکەکاندا مامەڵەو رەفتارو هەڵسوکەوت بکەن.. تا مردنیش لەسەر ئەو شێوازەی خۆی بەردەوام بوو، ئیدی چیخۆف لە هەموو جیهاندا بوو بە رێبازو شێوازێکی ئەدەبی تایبەت.

چیخۆف، لە روسیادا قوتابخانەیەکی گەورەی چیرۆکنووسی دامەزراند. چیرۆکەکانی چیخۆف لەسەر بناغەی ئەزموون و بابەتگەری رۆنراون و ساتە زیندوو و برگە کورتەکانی ژیانی هەڵبژاردووەو کردوونی بە هەوێنی چیرۆکەکانی. تا بۆی کرابێ خۆی لە نەخشەو بونیادی ئاڵۆز و پڕ پێچ و پەنا دوورگرتووە. هەڵبەتە قوتابخانەی چیخۆف کاری کردۆتە سەر زۆربەی کورتە چیرۆکنووسەکانی پاش چیخۆف، لەوانە:

(کاترین مەنسفیلدی( ١٨٨٨-١٩٢٣) نووسەری ئینگلیزی ، شروود ئەندرسنی(١٨٧٦-١٩٤١) نووسەری ئەمریکایی .

چیخۆف لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا پەردەی لەسەر لایەنە تراژیدییە پەنامەکییەکانی ناو ژیانی رۆژانە لادەبرد، لە بری باسکردن و شرۆڤەی رووداوەکانی ژیان، هەوڵی دەدا ژیان نیشان بدات. واتە رووداوو دەوری رووداو لە چیرۆکە کورتەکانی چیخۆف زۆر کەمەو زیاتر ژیانی رۆژانەی بەرجەستە کردووە.

چیخۆف لە چل و چوارساڵیدا کاتێ کە مرد (تەمەنێکی زۆر کورتە) ڕەوش و ڕەوتی چیرۆکنووسی جیهانی گۆڕی بوو، ئیدی شێوازی ئەدەبی چیخۆفیەت باوی سەندو ڕەونەقی پەیداکرد.

دیارە ئەم کارەی چیخۆف بۆ سەردەمی خۆی تازە بووە و هەر بۆیەش بووە بە قوتابخانەیەکی ئەدەبی گەورەی ئەوتۆ کە نەك هەر کاری کردۆتە سەر چیرۆکنووسانی ڕوسیای سەردەمی خۆی و پاش خۆی، بەڵکو کاری کردۆتە سەر چیرۆکنووسانی هەموو دنیاو ئەوروپاو خەڵکانێکی زۆر لاساییان کردۆتەوە. بۆیە پەرەسەندنی کورتە چیرۆکی دنیا قەرزار باری چیخۆفە، چونکە توانی بەزەبری بەهرەی پڕ داهێنانی خۆی، تایبەتمەندییە ڕوحی و دەروونییەکانی خەڵکانی ئاسایی و ڕەمەکی مەردم بەرجەستە بکات و بە یەکەمین پێشڕەوی ئەم مەیدانە دەژمێردرێ..

سادەیی و ڕاستگۆیی خەسڵەتی هەرە باوی چیرۆکی چیخۆفە.. بۆ خۆیشی پیاوێکی سادە و بێ فیزو دەعییەو بێ هەوا بوو. قەت خۆی لە ڕووداوی چیرۆکەکانی هەڵنەدەقورتاند.

چارەسەری بۆ گیروگرفتی قارەمانەکانی دانەدەنا. ڕێزی زیرەکی خوێنەری دەگرت و پێی وابوو خوێنەر دەبێ بۆ خۆی ڕایەك هەڵێنجێ... چیرۆکەکانی مەیدانی ڕووداوی گەورە، ڕستەی ئاڵۆز و پڕ ئاهەنگ، هەڵوێستی پاڵەوانانە نەبوون. بەڵکو مۆسیقایەکی هێدی و ئارام، گەرم، کاریگەر، و پرسیار وروژێن بوون. *دیارە خەڵکێك کە فێری پرسیار بوو بەدووی وەڵامدا دەگەڕێ، کەسێك بەدووی وەڵامدا گەڕا، دەکەوێتە سەر ڕاستەڕێگەی بیرکردنەوە، کەسێك کەوتە سەر ڕاستەڕێگای بیرکردنەوە، ئیدی فێر دەبێ چۆن بژی و بەرگری لە خۆی و لە ژیان بکات، بەئاسانی نەخەڵەتێ و دەستخەڕۆ نەکرێ و ژیانێکی مرۆڤانە دابهێنێ.*

هەڵبەتە وەستاو گەورە چیرۆکنووسانی وەك ئەدگار ئالن پۆ و موپاسان و پەیڕەوان و موریدانی ئەوان زۆر پابەندی یەکێتی کاریگەری چیرۆك بوون و لە بونیادنانی هەر چیرۆکێکیاندا ئەم مەسەلەیەیان ڕەچاودەکرد و چۆنییەتی گواستنەوەیان بۆ خوێنەر مەبەست بوو.. بەڵام لای چیخۆڤ تازەگەر بایەخی بونیادی ئەم یەکێتیی کاریگەرییە تەواو کەم دەبێتەوە و بایەخی پێکهاتەیی خۆی لە دەست دەدات و لە سەرانسەری چیرۆکەکەدا دەتوێتەوە و وەکو ڕەگەزێکی زەق و دیار نامێنێتەوە. چیخۆف، هەوڵیداوە لە هیچ شوێنێکی چیرۆکەکانیدا دیار نەبێ و لە هەمان کاتدا لە هەموو شوێنێکیشدا هەبێ، تا چیرۆکەکانی وەکو ژیان بابەتی وبێ لایەنانە بنوێنن هەر بۆیەش زیاتر پرسیاران دەهاڕوژێنێ و خۆی لە دۆزینەوەی چارەسەران دەدزێتەوە و ئەمە بۆ خوێندنەوەی خوێنەر دادەنێ.

چیخۆف نووسەرێك بوو خۆی لەدرێژ دادڕی نەدەداو نەیدەویست هەستی خۆی، بە چاك و بە خەراپ لە چیرۆکەکانی باربکات. وشەی لە جێی خۆی بەکاردەهێناو هەر وشەیەکی بە پێویست نەزانیبا خێرا لایدەبرد و باوەڕی وابوو گونجاوترین وشە لە گونجاو ترین شوێندا بەکاربێنێ و هەر بۆ ئەمماناو مەبەستە گوتەیەکی زۆر باوی هەیە کە دەڵێت: ((ئەگەر لە پەردەو دیمەنی یەکەمدا تفەنگێکت بە دیوارەوە هەڵواسی، ئەوا بێ چەندو چوون دەبێ لە پەردەی دووەم یان سێیەم دا بیتەقێنی.)).

چیخۆف ئەو دیمەن و ساتە زندووانە هەڵدەبژێرێ و چیرۆکەکانی لەسەر ڕۆدەنێ کە هەر کەسێك و بەئاسانی هەستی پێناکات، هەڵبەتە ئەم هەڵبژاردنە بەڕادەیەك کاریگەرو وەستایانەیە کە دەرگای هزرو بیری قارەمانەکانی بۆ خوێنەر دەکاتەوەو خوێنەر دەچێتە ناو زهنی خەڵکانی

ترەوە.. ئەمە یەکێك بووە لە بەهرە دەگمەن و دیارەکانی چیخۆف کە لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا بە تایبەتی لەوانەی ئاخرو ئۆخری ژیانیدا رەنگی داوەتەوە.

* * *

سەرەتاو کۆتایی چالاکییە ئەدەبییەکانی چیخۆف دەکەوێتە نێوان سالآنی ١٨٨٠ – ١٩٠٤وە. چیخۆف هەر لە سەرەتاکانی دەستپێکردنەوە شۆرەت و نێوبانگی دەرکرد، چونکە بەناو ژیان دەکەوت و بڕگە زیندووەکانی ناو ژیانی رۆژانەی خەڵکی وەردەگرت و ژیانێکی هونەرییانەی پێدەبەخشییەوە و نەدەچوو قارەمانەکانی لەنێو تەم و مژی وەسفی وردو دوورو درێژدا بخنکێنێ و هەقیقەتیان بشارێتەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە لە رێگەی چەند وشەیەکی کورتی کەمەوە قارەمانی چیرۆکەکانی دەخولقاندن و هونەرییەتێکی ئەوتۆی پێدەبەخشین کە لەبەر چاوی خوێنەردا گیانیان پەیدا دەکردو بە زندوویەتی بەناو واقیعی چیرۆکەکان دەکەوتن و درێژەیان بە ژیان دەدا. هەڵبەتە نابێ ئەوە لە بیربکرێ کە چیخۆف زۆر وەستایانەو لە رێگەی گفتوگۆوە وەکو رەگەزێکی هونەریی کاراو کاریگەر، قارەمانانی چیرۆکەکانی بەرجەستە دەکردو هەر ئەمەش جۆرە تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی بە شێوازی چیرۆکنووسی ئەو بەخشی کە هەر لە سەرەتاوە سەرنجی خوێنەرانی نەك هەر روسی، بەڵکو خوێنەرانی هەموو دنیاو ئەوروپاشی بۆ خۆی راکێشا.

چیخۆف ئەگەرچی ژیانی سەردەمی منداڵێتی سەخت و دژوارو ناخۆش بوو، لێ هەر لە منداڵی ڕا باوەڕی بە ئایندەیەکی گەشترو روونتر هەبوو. هیوا و ئاواتێکی زۆری لە دڵدا بوو، هەستیدەکرد تاگانروگی زێدی ناوچەیەکی تەنگە و ناکرێ پاشە رۆژی خۆی بەوێندەرەوە ببەستێ، بۆیە کە دەچووە دوکانەکەی بابی و لە جیاتی ئەو دوکانداری دەکرد، بە باڵی خەیاڵ دەفڕی و گەشت و سەفەرێکی دوورو درێژو بەسام و شکۆی وەکو هی ناو حیکایەتەکانی دایکی، بە سەرانسەری روسیادا دەکرد و بیری لەوە دەکردەوە تۆبڵێی بۆی بلوێ سەری خۆی هەڵگرێ و مل بەو دنیا ئاڵۆزو جەنجاڵەوە بنێ و دنیایەك ئاسۆی تازە کەشف بکات و دەرووی نوێ بدۆزێتەوە؟! کلیلی هەموو ئەو ئاوات و خۆزگانە هەر خوێندن بوو، بۆیە بە جۆرێ ملی پێوەنا، تا بوو بەو چیخۆفەی لەگەڵ چیرۆك و بەرهەمەکانیدا سەفەری هەموو دنیای کردو گەییە دوورترین و لە بیرکراوترین سوچی ئەم جیهانە پانوپۆڕە و چیخۆفیەت بوو بەزاراوەیەکی ئەدەبی و رۆشنبیریی سەر زاری هەموو ئەهلی ئەدەب و رۆشنبیری. چیخۆف وێڕای ئەوەی خاوەنی قوتابخانەو شێوازی تایبەتی چیرۆکنووسین بوو، بەلآم هەرگیز لە خۆی بایی نەبوو، بەڵکو هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو، شێوە و شێوازی هونەری تازەترو دەوڵەمەندتر و کاریگەرتر بدۆزێتەوە و ئەمەش بە جوانی لە چیرۆکەکانیدا رەنگیداوەتەوە و مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ، بەهەموو ئاڵۆزی و هەڵکشان و داکشانییەوە بابەتی هەوەڵ و ئاخیری چیرۆکەکانین..

چیخۆف، وێڕای تەمەنکورتی، بە یەکێك لە نووسەرە پڕ بەرهەمەکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێ. لە پاڵ پیشەی دکتۆرییەوە، دەیان نمایشنامەی کورت و درێژی نووسیوە، نزیکەی ٦٠٠ چیرۆکی کورت و درێژ، سەدان گوتارو یادداشتنامەو هەزاران نامەی نووسیوە ((ئەو نامانە کۆکراونەتەوەو لەو دواییانەدا بە ١٢ بەرگ چاپ و بڵاوبوونەتەوە.)) دیارە ئەم بەرهەمە زۆرە خۆی لە خۆیدا نیشانەی بەهرەمەندی لە رادەبەدەری چیخۆفەو ئەوەی کە یارمەتی چیخۆڤ داوەو

هانی داوه، زۆربەی چیرۆکەکانی لەگەڵ یەکەم بڵاوبوونەوەیان لە روسیادا، خێرا دەقۆزرانەوەو دەکران بەزمانی ئەوروپایی. چیخۆف لە ساڵی ١٨٨٨دا لە لایەن ئەکادیمیای زانستێن ئیمپراتوریەتی روسییەوە، خەڵاتی ئەدەبی پوشکینی پێبەخشرا کە بریتی بوو لە (٥٠٠ رۆبڵ).

چیخۆف بەهەموو پێوانەو پێناسەیەکی ریالستی، چیرۆکنووس و نووسەرێکی ریالستی بوو.. باوەڕی هەبوو کە هونەر دەکاتە رەنگدانەوەی حەقیقەتەکانی ژیانی مرۆڤ و بەبێ مرۆڤ و لە دەرێی پەیوەندی و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤدا چ هونەرێك نییەو هونەر ئاوازێکە بۆ بەشەرییەت دەخوێنرێ. بۆیە چیخۆڤ چیرۆکنووس شان بەشانی گەورە نووسەرانی وەکو گوگوڵ و بلینسکی زەمینەی بۆ ((هونەر لە پێناوی خەڵکی و بەزمانی خەڵکی و بۆپێشڤەبرنی خەڵکی)) خۆشکرد.

چیخۆف کەسێکی هێندە پاك و بێگەردو یەکروو و بێپەردە بوو، کە بەرانبەرەکەی خۆ بەخۆ لە بن پەردەو توێکڵان دەهاتە دەرێ و وەکو چۆن هەیە ئاوا خۆی نیشاندەدا.. چیخۆف بەدرێژایی تەمەنی خۆی، لە خۆی نەگۆڕا، چونکە بۆ خۆی مرۆڤێکی سادە وبێفیزو دەعییەو بێ هەوابوو، هەموو شتێکی سادەی خۆشدەویست. هونەری چیخۆف لەوەدا بوو کە لە هەموو شوێنێکدا پەردەی لەسەر گەندەڵی و ساختەچێتی لادەبرد.. هەر بۆیە مرۆڤ کە چیرۆکەکانی دەخوێنێتەوە، هەست بە گەڵاڕێزانی رۆژێکی غەمناکی ئاخرو ئۆخری وەرزی پایز دەکات. دنیا ساف و بێگەردە، شێوەی درەختە رووتەکان، ماڵە تەنگەکان و خەڵکانی خەمبار بە تەواوەتی دیارە. هەموو شتێك غەریب، بێ جوڵە، بێ ئومێد، تەنیا و بێکەسە. ئاسۆی شینباوی بۆش و بەتاڵ، دەگەڵ ئاسمانی بێڕەنگ و روو یەکانگیر دەبێت.

زۆربەی قارەمانانی نێو چیرۆکەکانی چیخۆف کە هەر یەکێکیان دەنگدانەوەی لایەنێکی کۆمەڵگەی سەردەمی چیرۆکنووسن، خەڵکانێکی دەستەپاچەو بێ سەرو بەرو گەوج و کەودەن و تەمەڵ و ئیشنەکەرو ترسنۆکن و لە بری ئەوەی بیر لە چاککردنی وەزع و حاڵی ئەمڕۆیان بکەنەوەو ژیانیان بگۆڕن، دادەنیشن و خەیاڵ پلاو بە ئایندەوە لێدەدەن وەکو ئەوەی ئێستا هیچ پەیوەندییەکی بەوانەوە نەبێ و رەگ و ریشەی بەدبەختی و رۆژ رەشییان لە ئێستادا نەبێ. هەڵبەتە چیخۆف وەکو هونەرمەندێکی گەورە پێش ئەو خەڵکە کەوتووەو لە مینبەری چیرۆکەکانییەوەو بەو پەڕی دڵسۆزییەوە هاوار دەکات:

— دۆستانی من خراپ دەژین، ئەم جۆرە ژیانە مایەی شەرمەزارییە.

* * *

قارەمانی چیرۆکەکانی چیخۆف لە ناوجەرگەی ژیانەوە هەڵقوڵابوون. قارەمانی دوور لە خۆنواندن و سینگ دەرپەڕاندن و فسفس پاڵەوانێتی بوون. چیخۆف لە چیرۆکدا هەوڵینەداوە هیچ دەردێکی مرۆڤایەتی چارەسەر بکات، بەڵکو تەنیا کەشفی کردووە، زەمینەی بۆ چارەسەران خۆشکردووە.. دیارە ئەو گیروگرفت و کێشەو ئاستەنگانەی چیخۆف وەکو نووسەرێکی ریالیست دەیانخاتە روو، بە ڕەگو ریشەو قوڵن، ریشەیان لە ناو کۆمەڵگەی روسی بە تایبەتی و کۆمەڵگەی بەشەریدا بەگشتی، داکوتاوە.. هەر لێرەشەوە چیخۆف توانی شەقڵ و مۆرکی جیهانی بە ئەدەبەکەی بدات و وەکو نووسەرێکی پەیامدار هەست بە ترپەی دڵی واقیعەکەی ئەو کۆمەڵەش بکات کە تێیدا دەژی..

دیاره رووداو، وەکو ڕەگەزو توخم و بنەمایەکی گرینگی چیرۆك، دەبیَ کەسیَکی مادی یان مەعنەوی هەبیَ بۆ ئەنجامدان و بەرجەستەکردنی. جا بەم پیَیە هەر کرداریَك، بکەری نەبیَ، نابیَ بەرووداویَکی هونەری.. هەر بۆیەش رووداوی چیرۆك و قارەمانی چیرۆك زۆر پەیوەستن بە یەکەوە و رووداو دەبیَت بە سیَبەری قارەمان و واتە رووداو دەبیَت بە رەنگدانەوەی قارەمان و قارەمان دەبیَت بە ویَناو بەرجەستەکاری رووداو. جا بۆیە ئەگەر ئەم هاو پەیوەستەگییە لە نیَوان رووداو و قارەماندا نەبیَ، ئەوا رووداو رەونەقی خۆی وەکو هونەر لە دەست دەدات و دەبیَت بە هەوالیَکی ئاسایی و چەند جوان بیَ دەکاتە کۆپیَیەکی موو بە مووی واقیع و پاشان لەناو جەرگەی رووداوە رۆژانەو زۆرو زەبەندەکانی ژیاندا ون دەبیَت.

هەر لە بارەی رووداوەوە دەبینین چیخۆف بە تایبەتی لەو چیرۆکانەدا کە بابەتی کۆمەلایەتیان لەخۆ گرتووە، هەولنادات کۆتاییەکی بنجبڕ بەدەستەوە بدات، چونکە باوەڕی بەوەیە کە نووسەر لە سەریَتی راستکۆیانەو بویَرانە گرفتە کۆمەلایەتییەکان نیشان بدات نەك چارەسەریان بۆ بدۆزیَتەوە، چونکە دۆزینەوەی چارەسەر کاری چیرۆکنووس نییە، بەلکو کاری پسپۆڕانی بواری کۆمەلناسییە، لە کاتیَکدا نووسەر دەبیَ زەمینە بۆ کاری ئەو خۆش بکات.

زۆربەی قارەمانانی چیخۆف، قارەمانی بازنەیین، هەر قارەمانەو چەندین تۆیی هەیە، قارەمان بەخۆی و بیرو بۆچوونییەوە دەکەویَتە کیَشەو قەرقەشە لەگەل ویژدانی خۆیدا، دەگەل کۆمەلی سەردەمی خۆیدا.

پیَویستە لیَرەدا ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکریَ کە لایەنی تەوس زالە بەسەر زۆربەی چیرۆکی چیخۆفەوە. دیارە چیخۆف، لە تەوس و تەنزیش دا، چیخۆفانە هاتۆتە مەیدان و وەکو خەلکی دی نییە، هەرچی مەسەلە هەن لە چاوی چیخۆفدا هەم پیَکەنین ئامیَزەو هەم خەمامیَز، واتە پیَکەنین و خەم دوو رووی یەك مەسەلەی ژیانن و ئەوەی ئەمیان دەرك نەکات ئەویتریشیان دەرك ناکات. زندوویەتی بەرهەمی چیخۆف لە شیَوازو زمانی نووسینیدا نییە، چونکە شیوازو زمان زۆر جیَی بایەخی چیخۆف نەبووە، بەلکو نەمری و زندوویەتی بەرهەمەکانی لەوەدایە کە توانیویەتی ساتە هەرە زندووەکانی ژیانی هەرە تایبەتی مرۆڤی روسی بە جۆریَ بخولقیَنیَتەوە و هونەرییەتیَکی ئەوتۆی بداتیَ کە سنوری نەتەوە و وولاتی خۆی ببەزیَنیَ و لە دەرگاری مرۆڤایەتی بدات و بەهای ئینسانیەت و جیهانییەت وەربگریَ و دوورترین مرۆڤی ئەم سەر زەمینە راستگۆیانە بدویَنیَ..

بە هەرحال بابیَینەوە سەر لایەنی تەوس و تەوسکاری. دیارە تەوسیش بۆ خۆی لە سۆزی مرۆڤانی بەدەر نییە.. هەلبەتە زالی ئەم لایەنی تەوسکارییە لەلای چیخۆف لە سەریَکەوە دەگەڕیَتەوە بۆ ئەوەی کە ئەدەبی روسی لە زۆربەی ئەدەبیاتی ئەورووپی واقیعیترە و واقیعییەتیش کۆلەکەی ئەدەبی تەوسئامیَزە و هەر بۆیەش چیخۆف وەکو پیَشڕەویَکی ریالیستی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدە، توانی تەوسکاری بکات بە مەودایەکی هونەری گرینگ لە مەوداکانی نیَوەرۆکی ئەزموونی هونەری.. دیارە تەوسکاری لای چیخۆف بۆ پیَکەنین نەبووە، بەلکو شیَوازیَکی تایبەت بووە بۆ کەشفکردنی خەوش و عەیبە کۆمەلایەتییەکانی ناو کۆمەلگە.

هەلبەتە کە باسی ئەدەبی واقیعی دەکریَ، بە مانای کۆپیکردنی واقیع وەکو خۆی نییە، چونکە لە دنیای ئەدەبیاتدا ئەدەبیَکی واقیعی پەتی، یان ڕۆمانسی پەتی نییە، رەنگە گرنگترین سیمای

ڕەوتی واقیعی، ڕاستگۆیی بیٚ لە دەربریندا، دیارە مەبەست لە دەربرین، ئەو دەربرینەیە کە لە چوار چێوەی ئەزموونی هونەریدا بەرجەستە ببیٚ، بە جۆرێك بەرجەستە ببیٚ کە ڕاستگۆیی دەربرین و گەرمی ئەزموونەکە لە یەکدیدا جۆش بخۆن و یەکەیەکی هونەری یەکپارچە دروست بکەن. کەواتە ئەدەبی واقیعی بەو دەقە ئەدەبییە هونەرییانە دەگوتریٚ کە لەباری شێوەو ناوەڕۆکەوە پتر بەلای واقیعیەتدا دەشکێتەوە، بەلاّم ئەمە بەو مانایە نییە کە نابیٚ چ شەقلٚ و مۆرکێکی ڕۆمانسیانەی پێوە بیٚ، هەر جوانکاری، کە تایبەتمەندییەکی زەقی ئەدەبە، بۆخۆی لە بە ڕۆمانسی کردنی ئەزموونی هونەری و ئەدەبی بەدەرنییە و نابیٚ. کەواتە واقیعیەت دەکاتە هونەراندنێکی ڕاستگۆیانەی واقیع نەك کۆپی کردنی واقیع.

چیخۆف بە سروشت مرۆڤێکی خاکی و بێهەواو بێفیز بوو، ڕۆژیٚ لە ڕۆژان، ناو و شۆرەت تەفرەی نەداوەو لە خۆی نەگۆڕاوە. قەت خۆیی بە نووسەر نەدەزانی، لە نامەیەکیدا بۆ نیکۆلای برای دەڵێت: ( جگە لە پیشەی دکتۆری کە ژنی شەرعیمە، ماشوقەیەکیشم هەیە کە ئەدەبە" **بەلاّم باسی ناکەم. چونکە ئەوانەی لە لاشەرعییەتدا دەژین، لە لاشەرعییەتدا دەمرن).**

بەڕاستی هێندەی ماشوقەکەی (ئەدەب) لەزەتی پێدەبەخشی، ژنەکەی (دکتۆری) ئەوەندە لەزەتی پێنەدەبەخشی.

بە هەرحالٚ چیخۆف هەردوو پیشەی دکتۆری و نووسەری خۆشدەویست، ئەوەتا لەو بارەیەوە لە ساڵی ١٨٩٩دا دەڵێت: ((... بێگومان خوێندنی زانستی پزیشکی کاری کردە سەر کاری ئەدەبیم، باری سەرنج و ڕامان و تێفکرینی لە لا دەوڵەمەند کردم، زانیارییەکی وەهای پێبەخشیم کە تەنیا مەگەر دکتۆرێك لە بایەخیان، لە ناو کارە ئەدەبییەکانمدا حاڵی ببیٚ. بەهۆی ئەم زانیاریانەوە توانیم لە زۆر هەڵە بخەلەسێم.

گوتمان شۆرەت تەفرەی چیخۆڤ نەداوەو لە خۆی نەگۆڕاوە. زۆری بەرهەم، کوێری نەکردووە. بە چیرۆکەکانی خۆی دەگوت (وردەواڵە) هەر لەو بارەیەوە دەڵێت: ((... ئەو پەڕەکەی تا حەوت هەشت ساڵێکی دی بەرهەمەکانم دەخوێننەوەو پاشان لە بیرم دەکەن..)) کەچی ئەوەتا وا قەرنێك بەسەر ئەو قسەیەیدا تێدەپەڕیٚ و هێشتاش بەرهەمەکانی دەخوێنرێتەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەهرەو توانایەکی زۆر گەورەی لە بواری هونەراندنی ساتە زیندووەکانی ژیاندا هەبووە.

چیخۆف تا لەژیاندا بوو خوێنەری زۆری هەبوو، لیٚ کە شۆڕش بەرپا بوو، واتە زۆر پاش مردنی چیخۆف، ژمارەی خوێنەرانی یەجگار زیادی کردو لە یەکێتی سۆڤیەتدا نزیکەی پەنجا ملیۆن نوسخە لە بەرهەمەکانی چاپکرا. هاوعەسرانی چیخۆف هەڵپەی وەدەست هێنانی نەمریان بوو، لیٚ بەرهەمێکیان خوڵقاند کە ماوەیەکی کەم ژیا. بەلاّم چیخۆف لە سەردەمی خۆی دانەبڕاو هەزاران داوو سەرەداو بە سەردەمی خۆیەوەی دەبەست و لە ئەنجامی فرە هەڵوێستییەوە، زیندوویەتی خۆی ، تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش هەر پاراستووە.

چیخۆف یەکێك بوو لەو ئەدیبە بە سەرنجانەی، ئەو شتانەی لە مرۆڤدا دەبینی کە خەڵکانی دیکە نەیاندەبینی و هەر بەوەندەشەوە نەدەوەستاو تێکەلٚ بە خۆشی و ناخۆشییان دەبوو، و دەچووەپێستی قارەمانەکانییەوە، وەکو ئەوان دەژیاو ڕاستگۆیانە گوزارشتی لەو ژیانە بە هەموو لق و پۆپەکانییەوە دەکرد، چیخۆف ئەگەر چی کەم ژیا، بەلاّم سەدان ژیانی لە پێستی قارەمانەکانیدا جەڕباندو هەر ئەمەش یەکێکە لەو نهێنییانەی کە درێژەی بە ژیانی هونەری داوە

و تاكو رۆژگاری ئەمڕۆ لە دنیای هونەردا هەر زیندووە. کەچی چیخۆف لەگەڵ ئەمەشدا هەرگیز لە خۆی رازی نەبووە، خووی بە نووسینەوە گرتووەو ئاسودەیی خۆی لە نووسیندا بینیوەتەوە، بە خۆی دەڵێت: ((... کە دەنووسم هەست بە ئاسودەیی دەکەم.. بەڵام هەرکە ئەو نووسینەم بڵاودەبێتەوە لێی بێتاقەت دەبم، هەستدەکەم ئەوە نییە کە من دەمویست، بەڵکو هەڵەیە، خەفەت بەوە دەخۆم.. بەندە، هەرگیز دڵبەندو ئاشقی خۆم نەبووم، من خۆمم وەکو نووسەرێك خۆشناوێ...))

* * *

چیخۆف وەکو هونەرمەند وا باسکراوە کە رووی کردۆتە هونەرێکی سادە، ئەزموونە سادەکانی هەڵبژاردووە و بە وێنەی سادە و ساکار ،بەشێوازێکی ساکار بەرجەستەی کردوون. هەڵبەتە ئەم هەموو سادەیی و ساکارییە هەستێکی قووڵ و دەگمەنیان لە خۆگرتووەو ئەمەش خۆی لە خۆیدا نهێنییەکی دیکەی هونەرە مەزنەکەیەتی. بۆ وێنە چیرۆکی (فانکا) ئەگەرچی رووداوێکی سادەی ناو ئەم ژیانە جەنجاڵەیە، بەڵام بە جۆرێ هونەرێنراوە کە هەڵاوی ژیانی لێهەڵدەستێت.. رەگەزی مرۆڤدۆستی بەجۆرێك لە نەستی هونەری چیخۆفدا ریشاژۆ بووە، بووە بەدیارترین دیاردەو رواڵەتی هونەری و هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لە پێشڕەوی کورتە چیرۆکی جیهانییەوە، ببێ بە پێشڕەوی ئەدەبی مرۆڤانی، و زۆربەی هەرە زۆری توێژو چینە کۆمەڵایەتییەکان لە چیرۆکەکانیدا هەن و مامەڵەی هونەرییان دەگەڵ کراوە.

بە هەرحاڵ چیخۆف بوو بەو هونەرمەندەی کە سێبەری بەسەر سەرلەبەری ئەدەبیاتی کورتە چیرۆکی هەموو دنیاوە هەبێ و ببێ بە قوتابخانەو ناوی چیخۆفیەت بگرێتە خۆ. چیخۆفیەت وەکو قوتابخانەیەکی ئەدەبی رووی کردە مرۆڤی ئاسایی و لە باری ئەدەبی و هونەرییەوە کردی بە قارەمانی ئەدەبیاتی چیرۆکی سەدەی نۆزدە. هەڵبەتە ئەمەش بۆ خۆی شۆڕشێك بوو، شۆڕشێکی گەورە بوو لە چەمکی قارەماندا. چیخۆفیەت قوتابخانەیەك بوو د. ئەحمەد شەرقاوی گوتەنی شۆڕشێکی لە بونیادی تەقلیدی کورتە چیرۆکدا نایەوە. واتە لە سەرەتاو لوتکە و کۆتایی یاخی بوو.. ئەوە بوو ئەو بابەتە چیرۆکەی هێنایە ئاراوە کە هەڵوێست لەمەڕ ژیان بە هەموو گەرمو گوڕی و راستگۆییەکییەوە وەردەگرێ... دەلالەتی قووڵی بە شتە سادەکان بەخشی. چیخۆف وێڕای تەمەنی کورتی توانی لە رێگەی کۆمەڵێك بەرهەمی نەمرەوە، بە شدارییەکی دیار لە داڕشتنەوەی ویژدانێکی بەشەری باڵادا بکات. چیرۆکی ئەم نووسەرە بەڵگەنامەی هەست و سۆزو بەخششی بێ سنوورە.هەقە لێرەدا ئاماژەیەکی خێرا بۆ ئەوە بکرێ کە ئاساییە جۆرە پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەنێوان چیخۆف و قارەمانەکانیدا بدۆزرێتەوە. هونەرمەندان لێکدی ناچن، بە شێوەی جیاواز کاردەکەن، بەڵام ئەستەمە بەرهەمێکی هونەری هەبێ کە هونەرمەند بەشێك لە ژیانی خۆی یان هەستەکانی خۆی تێنەئاخنی بێ" هونەر تەنیا باری سەرنجی هونەرمەندی لەمەڕ ژیان ناوێ، بەڵکو ئەوەشی دەوێ کە هونەرمەندەکە بەشداری لە ژیاندا بکات..

کەواتە هەر قارەمانێك بگری لە دوورەوە یان لە نزیکەوە رەگێکی دەچێتەوە سەر خودی نووسەرەکەی.

* * *

چیخۆف، زیاتر خۆی لە وردە بابەتان داوە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چیخۆف تەنیا خۆی لەو شتانە دەدا کە دەیزانین و دەیتوانی بەشێوازی خۆی ئاراستەو فرمۆلەیان بکات.. واتە چیخۆف تەنیٚ خۆی لەو بابەتانە داوە کە شارەزایی لێیان هەبووە.

چیخۆف لەو بوارەشدا بە چاوێکی تازەوە دەیڕوانییە دنیاو بە شێوەی تازە باسی دەکرد. بۆیە بەرهەمەکانی پیر نەبوون و هەر بە تازەیی مانەوە.. چیخۆف وەکو دەنگی سەردەم و قۆناغی خۆی، توانی چیرۆك لە سەرەتای درێژو کۆتایی بەشەرح و تەفسیلٚ و وەسفی روالەتی قارەمانان و باسکردنی ژیانیان بخەلەسێنیٚ و لەم بارەیەوە دەلێت: ***((بەڕای من، کە لە چیرۆك دەبینەوە، پێویستە سەرەتاکەی و کۆتاییەکەی لابەرین، چونکە ئێمەی ئەدیب لەو دوو شوێنەدا، لە هەر شوێنێکی دی پتر درۆیان دەکەین.. پێویستە تا دەتوانین بە کورتی قسان بکەین، بەو پەڕی کورتی...))***

چیخۆف چونکە راستەوخۆ و زۆر بەجددی بەشداری ژیانی کردووە، ئەمە وایکردووە کە نەك هەر دیوی دەرەوەی واقیع بدینیٚ، بەلکو روحی مرۆڤ بە تەواوەتی و هونەرمەندانە بخاتە سەر بالی هونەرو بۆ هەموو دنیای بنێریٚ.

هەلبەتە نووسینی کۆمەلایەتی و نووسینی هونەری فەرقیان زۆرە.. نووسینی کۆمەلایەتی تەرخانە بۆ کارو کردەوەی خەلکی، بۆ نەزم و نیزام و دیاردەو رووداوە کۆمەلایەتییەکان، کەم و کوڕتییەکان دەستنیشان دەکات و داوای، چاککردنیان دەکات. بەلام هونەر دنیای ناخی مرۆڤ کەشفدەکات و پەردەی لەروو هەلدەمالیٚ،کاریگەریشی قولترو زیاترە. کاریگەرییەکەش لەوەدایە کە هونەر رژێمان ناگۆڕیٚ، بەلکو ئەو خەلکە دەگۆڕیٚ کە رژێمان دەخولقێنن. بۆیە چیخۆف ئەوەندە گویٚ بە روالەت و رووکار نادات و پتر بایەخ بەدنیای ناوەوەی قارەمانەکانی دەدات و شتە نادیارەکان کەشفدەکات و لە ناوەوە وێنەی هەموو قارەمانەکانی بە چاك و خراپ، گەمژە و زیرەك، سەرەکی و لاوەکییانەوە دەگرێت. هەلبەتە ئەم شێوازە زەمینەیەکی زیاتر بۆ قارەمانەکان دەڕەخسێنیٚ تا بەراستگۆیی زیاترەوە گوزارشت لە خۆیان بکەن.

(دەزگیران) دوا کورتە چیرۆکی چیخۆفە، دیارە ژمارەی کورتە چیرۆکەکانی پتر لە (٢٤٠) چیرۆکە، هەندێکیان زۆر کورتن، هەندێکیان بە روالەت شادن، هەندێکیان لە رادەبەدەر خەمینن، خەمینێکی کوشندە. هەلبەتە ئەم دنیا تێکەلەیە، رەنگدانەوەیەکی تەواوی ژیانی روسیای ئەو سەردەم و قۆناغەیە. لە جوتیارەوە بۆ ڕەبەن، لە مامۆستاوە بۆ عارەبانچی، لە قوتابییەوە بۆ بازرگان، هەموو توێژو دەستە کۆمەلایەتییەکان لەو چیرۆکانەدا دەنگ و رەنگ و کارو کاردانەوەیان هەیە.. خوێندنەوەی چیرۆکەکانی چیخۆف دەکاتە گەشتێك بە رابردووی روسیادا، گەشتێك سەرسوڕ دەهێنیٚ، گەشتێك لەگەلٚ دەلیل و رێنوێنێکی هێدی و ئارام و ساردو بە سەبرو حەوسەلە، هەموو شتێك نیشان دەدات و تەعلیق لەسەر هیچ شتێك نادات.. جا لەم سەری ئەم رێگا دوورو درێژو پڕ پێچەوە تا ئەو سەری، پیاو سەری لە چوونیەکی شێوازەکەی سوڕدەمێنیٚ.. سادەیی شێواز، وردی دەربرین، ونبونی نووسەر لەو دیوی کاراکتەرەکانەوە، بوون بە شەقلی زۆربەی چیرۆکەکانی. چیخۆف بە خۆی پێی وایە ***(کورتبڕی برای بەهرەیە)***..

تولستۆی لەمەڕ چیرۆکەکانی چیخۆف دەڵێت: *(( چیخۆف پوشکینی پەخشانە، وەکو چۆن دەنگدانەوەی سۆزی پوشکین لە بەیتەکانیدا دەبینین، هەمان شت لە چیرۆکەکانی چیخۆف دا دەبینین. هەندێ لەم چیرۆکانە بەڕاستی جوانن...)).*

چیخۆف پەنای وەبەر شێوازی کورتبڕی دەبرد. هەر وشەیەکی بەنهێنی و رازێك ئاوس بوو. گەورە ئەدیبانی دیکەی روسیا خوێنەریان لەگەڵ خۆدا دەگێڕاو لە هەڵکشان و داکشانی سۆزدا بە گەڵیان دەکەوتن، لێ چیخۆف هەقی بەسەر خوێنەرەوە نەبوو، لەناو رووداوو خوو تەبیعەتەکاندا بەجێی دەهێشتن. سۆزی خوێنەری نەدەهاڕوژاند تا بزە وەسەر لێویان بخات یان فرمێسك و رووندکان بزایەنێتە چاویان.. چ شتێکی بۆشەرح و شرۆڤە نەدەکردن.. بەڵکو زەمینەی بۆ خوێنەر خۆشدەکرد کە بە وردی لە قارەمانانی ناو چیرۆکەکانی بگەن.. جا فیکرو هزری چیخۆف لە بندێڕی چیرۆك و شانۆ نامەکانیدا بەدەر دەکەوت.. ئەگەر چی بۆ رۆژگاری خۆی رەشبین بوو، بەڵام باوەڕی تەواوی بە پێشکەوتن هەبوو.. مرۆڤێکی مەتریالست بوو، بەڵام لە ناخیدا جۆرە نیگەرانییەکی سۆفیانە هەبوو.

چیخۆف، یەکێکە لەو چیرۆکنووسانەی کە زۆری دەربارە گوتراوەو زۆربەی ئەو کەسانەش، رای تەوهینامێزیان دەربارەی هەبووە، ئەویش زۆر بە ساردی وەڵامی داونەتەوە، یان هەر بێدەنگی لێکردووە.

چیخۆف جارێ بە گۆڕکی دەڵێت: *((رەخنەگران لەو خەرەنگێزە دەچن کە بەگژ ئەسپدا دەچن و نایەڵن زەوی بکێڵێ. ئەسپ کار دەکات. هەموو ماسولکەکانی تورت و توند بووە، لە نکاوا ئەو خەرەنگێزە لە کەفەڵی ئەسپەکە دەوروکێ و پێوەی دەدات و دەکەوێتە گیزە گیز... من بیست و پێنج ساڵە ئەو رەخنانە دەخوێنمەوە کە دەربارەی چیرۆکەکانم دەنووسرێن، بەڵام چ ئاماژەیەکی بەنرخ و ئامۆژگارییەکی باشم لە لا نەماوەتەوە، جگە لە سکایدبیجیفسکی کە توانی کارم تێبکات کاتێ کە نووسی بەندە بەمەستی و سەرخۆشی لە پەنا دیوارێکدا دەمرم...))*

سکاید بیجیفسکی کە رەخنەگرێکی دیاری سەردەمی خۆی بوو، بەمجۆرە باسی بەرهەمی چیخۆڤ کردووە: (( ئەمانە بەرهەمی تەواونین، بەڵکو کۆمەڵە وێنەیەکی ئەدەبی لێکدابڕاون و پشتیان بە بابەتی زندوو بەستووە... ئێمە کۆمەڵە نوکتەیەکی کۆمیدی لای چیخۆف دەبینین کە تەنیا بۆ وەپێکەنین هێنانی خوێنەرانی رۆژنامان نووسراون...)).

صوفی لافیت، چیخۆف بەو هونەرمەندە گەورەیە دەزانێ کە توانی وڵاتی خۆی و سەردەم و قۆناغی خۆی وێنەبگرێ.. و لەم بارەیەوە دەڵێت: *((... روسیا لەلای چیخۆف واقیعیترو دیار ترو بەرینترە وەك لە بەرهەمەکانی غریبویدف و گوگول و تۆرگینیف یان تولستۆی. بەرهەمەکانی بریتییە لە پانۆرامای ژیانی روسیای ساڵانی ١٨٨٠ – ١٩٠٠)).* بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە مێژوونووس بووبێ یان مێژووی نووسیبێتەوە. هەڵبەتە چیخۆف وەکو کوڕی سەردەمی خۆی رەفتاری کردووە و لە نووسین و شێوازی نووسیندا شوێن پێی گەورە ئەدیبانی بەر لە خۆی هەڵنەگرتووە، بەڵکو شێوازو زمانێکی تایبەت بەخۆی داهێناوەو تۆلستۆی لەم رووەوە واهی ستایشی دەکات: *(( چیخۆف وەکو هونەرمەند لەگەڵ ئەدیبانی روسی بەر لە خۆی وەکو تۆرگینیف و دۆستوفسکی و یان بەندەدا، بەراورد ناکرێ.. چیخۆف شێوازی تایبەتی خۆی هەیە وەکو ئینتیباعییەکان. کە دەڕوانییە بەرهەمەکانی وا هەستدەکەیت ئەم مرۆڤە بێ جیاوازی*

*ڕەنگـان تێکـەڵ دەکـات و هـەر ڕەنگێکـی بەردەسـت بکـەوێ بـەکاری دێـنێ، بـێ ئـەوەی چ هاوئاهەنگییـەك لـەنێو ڕەنگەکانـدا هـەبێ، بـەڵام کـە تـۆزێ دوور دەکەوییـەوەو دووبارە تەمەشـا دەکەیـەوە هەسـت دەکـەی هاوئاهەنگییـەکی گشـتی هەیـەو وێنەیـەکی پرشـنگداری تەبیعـەتت لـە هـزرو بیرا بەرجەسـتە دەبـێ. بەڵگەیـەکی بـێ چەنـدو چـوون هەیـە کـە ئـەوە سـاغ دەکاتـەوە کـە چیخۆف هونەرمەنـدێکی ڕەسـەنە، ئـەویش ئەوەیـە کـە دەشـێت بەرهەمـەکانی بـۆ چەنـدین جـار بخوێنینەوە.))*.

چیخۆف لـە پـاڵ ئـەم دەق و چیرۆك و حیکایەتانـەدا، وەکـو پـەیامنێرو ئامادەکـاری ڕیپـۆرتـاژ، هەواڵ و راپۆرتەکانی لە ناو جەرگەی کۆمەڵەوە هەڵدەهێنجاو دایدەڕشتەوەو بەدیدو بۆچوونێکی رەخنەگرانەی روونەوە دەیخستەروو. دورگەی ساخالین یەکێکە لەو کارانەی. (دورگەی ساخالین) شـــەهادەی پزیشـــك و رۆژنامـــەوان و هاووڵاتییەکـــە، چـــیخۆف نووســـیویەتی. ئـــەم کتێبـــە دەنگدانەوەیەکی سەیری لە ناوەندە رۆشنبیریەکەی روسیادا هەبوو. حکومـەتی تـزاری ناچارکرد هەنـدێ خـەڵکی پسـپۆر بـۆ تاراوگـەی سـاخالین بنێـرێ و هەنـدێ کـار بـۆ گـۆڕینی وەزع و حـاڵی دوورخراوەو مەحکومەکان بکات.

( دورگـەی سـاخالین) یەکێکـە لـە بەرهەمـە ناودارەکـانی چـیخۆف، ئـەم بەرهەمـە بـەرەنجامی سەفەرێکی خۆیەتی بۆ تاراوگەی ساخالین و بەباری سەرنجێکی زۆر وردو لە قاڵبی ڕێپۆرتاژێکی رۆژنامـەوانی و بـە شـێوازێکی ئـەدەبی چیخۆفانە، ژیـانی بەنـدییان و زوڵـم و زۆر و بێـدادی نـاو بەندیخانەکانی پیشانداوەو بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن حوکمدراوانی مەحروم لـەو هیوایـەی کـە جارێکی دی خاك و زێدی خۆببیننـەوە، هـەموو شتێکی ئەخلاقی لەدەست دەدەن و هەرچییەك دەکـەن دەرکـی واقیـع ناکـەن.. بەهـەر حـاڵ ئـەم بەرهەمـە پـاش سـەفەرێکی چـیخۆف بـۆ ئـەروپاو گەڕانـەوەی بـۆ مۆسـکۆ لـە ٢/٥/١٨٩١دا دەسـت بـە نووسـینی کـرا، کـە بـۆ یەکـەمجار بـەزنجیرە لـە گۆڤاری (هزری روسی)دا هاتە بڵاوکردنەوە، خوێنەران زۆر بە تاسـەوە بەسـەریدا دابـارین، کەچـی زۆربەیان بێ هومێدبوون، چونکە چاوەنۆڕی بەرهەمێکی گەورەی درامی هاوتای ((یادگارییەکانی خانەی مردووان))ی دۆستوفسکیان لە چیخۆف دەکرد، کەچی سەیریان کرد سەربورێکی سادەی بێلایەنەو باسی ئەو ماوەیە دەکات کە نووسەر لەنێو زیندانەکاندا بەسـەری بردووە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا ئەم ریپۆرتـاژە سـەرنجی کاربەدەسـتانی ڕاکێشـا، حکومـەت لیژنەیـەکی لێکۆڵینـەوەی بـۆ ساخالین ناردو پاش ئەمە هەندێ کار بۆ چاککردنی ژیـانی زندانییـەکان کـراو چیخۆف دڵخۆشـی خۆی بەوە دەدایەوە کە کارەکەی بێهودە نەبووەو ڕەنجەکەی بەفیڕۆ نەچووە.

* * *

بێگومان ئەدەبیات لە قۆناغی مێژوویی و واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیری خۆی نایەتە دابڕان و لـە پرۆسـەیەکی کـارلێکی بەردەوامـدان.. بۆیـە چیخۆف وەکـو پێشـڕەوێکی ئەدەبی واقیعـی و وەکـو ئـەدیبێکی پەیامـدار هـاتووە تـا بـەزەبری هونـەر و لـە میانـەی هەڵوێسـتی مێژوییـەوە، پەیوەندییـەکانی نێـوان بـوون و کـار بەرجەسـتە بکـات و ژیـان لـە شـێوەی رۆژانـە هەڵوێستدا بە هونەر بسپێرێ.

بیرو بۆچوون و هەڵوێستی چیخۆف، لە بەرهەم و نووسینەکانیدا رەنگیان داوەتەوە. دیارە چیخۆف هەر باوەڕی بە تەرحی دۆزەکان هەبووە وئەمەی بە زەروری زانیوە بۆ هونەرمەند نەك چارەسەری کێشەکان.. و لەم بارەیەوە دەڵێت: ((هونەرمەند نابێ حاکم بێ بەسەر قارەمانەکانییەوە یان بەسەر ئەو شتانەوە کە باسی دەکات، بەڵکو هونەرمەند لەسەرێتی شایەتێکی مەوزوعی بێ و بەس. نووسەر بەلای چیخۆفەوە دادوەری دادگا نییە، بەڵکو شایەتێکی بێلایەنە... شایەتیش دوو جۆرن، شایەتی ئیتیهام و شایەتی دیفاع، بەڵام دەبێ هەردوکیان حەقیقەت بڵێن واتە ئەو شتە بڵێن کە دیتویانە یا زانیویانە بێ هیچ پێچ و پەناو شێواندنێك، جا دەکرێ نووسەر بە شایەت بشوبهێنرێ، ئیدی شایەتی ئیتیهام بێ یان دیفاع... چیخۆف هەرگیز شایەتی درۆی نەداوە، لە هەردوو حاڵەتی شایەتی ئیتیهام و دیفاعدا هەر حەقیقەتی گوتووە بێ ئەوەی هەوڵیدابێ ناوی تاوانبار بزڕێنێ یان شکایەتکار بکات بە قەدیس و بیپیرۆزێنێ.

چیخۆف باوەڕی وابوو کە درۆ لەهەر بوارو مەیدان و کارو پیشەیەکدا بکرێ ئەوا لە هونەردا ناکرێ بۆیە دەڵێت: ***((چاکی هونەر لەوەدایە کە ناتوانین درۆی تێدا بکەین.. درۆ لە دڵداری و خۆشەویستیدا لە گوینە، لە سیاسەت و لە پزیشکگەردیدا دەشێت خەڵکی تەفرە بدەی.. بەڵام خەڵەتاندن و خاپاندن لە هونەردا نایەتە کردن...))***

چیخۆف رای وایە نووسەر هەقی خۆیەتی سوود لە رەگەزەکانی ناو ژیان بۆ دەوڵەمەندکردنی نێوەڕۆك و ژیانبەخشین بەکارە هونەرییەکانی، وەربگرێ، خۆ پێی وایە ئەگەر ئەم پرۆسەی ئاوێتەکردنی واقیع و خەیاڵە نەمێنێ ئەوا ئەدەب وشك دەکات و دەمرێت.

چیخۆف، ئەگەرچی کەمتر پەرژاوەتە سەر تیۆریزەی ئەدەبیات، بەڵام خوێنەری وریاو هوشیار دەتوانێ لە دوو توێی نامە زۆرو زەبەندەکانیا و لە بندێڕی دەقە ئەدەبییەکانیدا پەی بە بیرو بۆچوون و رایەکانی لەمەڕ ئەدەبیات بەرێ، چیخۆف پێی وابوو ئەدیب لەسەرێتی مەسەلەکان بوروژێنێ و پرسیاران بخاتە روو نەك چارەسەران بدۆزێتەوە، نابێ هیچ وەعزدادانێکی ئەخلاقی لەپشت پەردەی هەر کارێکی ئەدەبییەوە هەبێ، یان پەیامێکی هەبێ، بەڵکو تەنیا ژیانویستی و ژیاندۆستی تێدا بهۆنەرێنرێ.. نووسەر دەبێ لە خزمەتی کاراکتەرەکانیدا بێ و دەبێ لە هەموو شوێنێکی بەرهەمەکەیدا هەبێ، بەڵام نەبینرێ.

چیخۆف ملیۆنان خەڵکی فێری زۆرشت کرد، بەڵام ئەم کارەی بەوەعزو ئامۆژگارییان نەکرد.

* * *

***دەوڵەت دەبێ لە یاساو دەستورەوە هەڵێنجرێ، دەنا دەبێت بە داهۆڵێکی بۆش و بەتاڵ و هەموو مانایەك لە دەست دەدات، بوونی راستەقینەی خۆی لە دەستدەدات، ئەوجا بۆ شاردنەوەی بوونی نا شەرعیانەی، دەکرێتە داردەست بۆ لە گۆڕنانی دادی کۆمەڵایەتی و ترساندن و تۆقاندنی جەماوەری خەڵك بەکار دەبرێ. بۆ زەوتکردنی ئازادی خەڵك بەکار دەبرێ، کە خەڵکی ئازاد نەبوو لە دەربرینی رای خۆیدا، ئەوا ناچارە بە تووڕەیی و بە توندی دەری ببڕێ... بەڵام تۆ وەرە ئازادی دەربرین و رۆژنامەوانی و بیروباوەڕ بدە بە خەڵکی بزانە هەنگێ چۆن هێمنی و ئارامی دێتە ئاوارە..***

راستە چیخۆف خۆی لە هەموو جۆرە حزبایەتییەك دوور گرتووە، بەڵام جیهانبینی سیاسی خۆی هەبووەو لە چیرۆکەکانیدا هونەریانە نیشاندراوە. واتە چیخۆف نە پابەندی حزب بووەو نە بەفەرمانی حزب گۆرانی گوتووە. نووسەرێکی ئازادی پەیامدار بووەو هەر بەمەش توانیویەتی بایەخێکی هونەری گەورە بە ئەدەبەکەی ببەخشێت. چیخۆف، بەشداری چ بزاڤێکی سیاسی نەکردووە، پێی وابوو سیاسەت سەنگەری ئەو نییەو دەتوانێ لە رێگەیەکی دیکەوە خزمەت بەگەل و وڵاتی خۆی بکات. چیخۆف عەوداڵی عەدالەت بوو، عەدالەتی بە بەردی بناغەی ژیانی ئابڕومەندانە دەزانی و بە درێژایی تەمەنی وەکو نووسەرێك بانگەوازی بۆ عەدالەت کردووە. ***چیخۆف هیچ هەڵوێستگیرییەکی راستەوخۆی لەمەڕ رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان نەبووە.. چونکە پێی وابووە سەنگەری ئەدیب و نووسەر تەنیا ووشەیەو تاقە چەکێك کە بۆ نووسەر حەڵاڵ بێ تەنیا قەڵەمەکەیەتی. کە نووسەر توڕەبێ، دەبێ بە قەڵەم توڕەبێ، کە هەڵوێستێکی هەبێ، دەبێ بە قەڵەم هەیبێ.. دیارە هەر قەڵەمەش شێوازو رێبازی تایبەتی خۆی هەیە.***

* * *

ئەگەر چی لە سەرەتای ئەم باسەدا زۆر بە کورتی و خێرایی ئاماژەیەك بۆ کورتەی ژیانی چیخۆف کراوە، بەڵام پێموایە کارێکی نابەجێ نابی ئەگەر ژیاننامەی خۆی لە زاری خۆیەوە بژنەفین کە لە وەڵامی نامەیەکی دکتۆر روسولیمو – کە هاودەورەی زانستگەی پزیشکی خۆی بووە – بەمجۆرە باسی خۆی دەکات: ((... لە ١٧/١/١٨٦٠دا لە تاگانروك لەدایك بووم. هەوەڵجار لە قوتابخانەی یونانی سەر بە کڵێسای ئیمپراتۆر کۆنستانتین دەستم بە خوێندن کرد... لە ساڵی ١٨٧٩دا چوومە کۆلێژی پزیشکی زانستگەی مۆسکۆ. لەو سەرو بەندەدا سەرم لە کۆلێژەکان دەرنەدەکرد. هەرچی هەوڵدەدەم بزانم بۆچی کۆلیژی پزیشکیم هەڵبژاردبوو، هۆیەك نادۆزمەوە. بەڵام پاشان لەم کارەم ژێوان نەبوومەوە. لە یەکەم ساڵی خوێندنی زانکۆدا کەوتمە نووسین و بڵاوکردنەوە لە چاپەمەنی و بڵاڤۆکاندا. تا وام لێهات لە کۆتایی ساڵانی خوێندنمدا بوو بووم بە نووسەرێکی پیشەیی، واتە نووسین بوو بوو بە پیشەم. لە ساڵی ١٨٨٨دا خەڵاتی ئەدەبی (پوشکین)م وەرگرت ساڵی دواتر چووم بۆ دوورگەی ساخالین تا کتێبێك دەربارەی دورخراوەو مەحکومەکانی رژێمی ئیمپراتۆری روسیا بنووسم.

لە ژیانی بیست ساڵەی ئەدەبیمدا جگە لە زۆر راپۆرت و گوتارو بیرەوەریان، کە زۆربەی رۆژان لە بڵاڤۆکانی ناو وولاتدا بڵاودەبوونەوەو – ئێستا کۆکردنەوەو نووسینەوەیان بەڕاستی کارێکی زۆر دژوارە – سەدان کورتە چیرۆك و چیرۆکی درێژم نووسیوەو بڵاوم کردونەتەوە. هەڵبەتە چەند نمایشنامەشم نووسیوە.

گومانم نییە کە خوێندنی پزیشکی، کارێکی سەیری کردۆتە سەر زەوق و پەروەردە و چالاکییە ئەدەبییەکانم. زانستی پزیشکی توانای بینینی منی زیادکردووە. زانیاریمی لەمەڕ جیهان و خەڵکی جیهان دەوڵەمەند کردووە. چ کەسێك وەکو دکتۆرێك ناتوانێ پەی بە بایەخی راستەقینەی پزیشکگەری و کاریگەری پزیشکگەری لە سەر نووسینەکانم بەرێ. کاریگەری راستەوخۆی زانستی پزیشکی لەسەر نووسینەکانم لە زۆر هەڵەو پەڵەو خزینی پاراستووم و دووری خستومەتەوە. ئاشناییم لەگەڵ زانستە سروشتییەکانداو بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ

ڕەوت و ڕێبازە زانستیەکاندا منی بەرەو ڕێگەی مەنتیق ڕێنوێنی کردووەو منیش هێندەی لە توانادا بووەو لە هەموو حاڵێکدا هەوڵمداوە لە بەرهەمەکانمدا یاساو ڕێسای زانستی ڕەچاو بکەم. هەڵبەتە هەندێ جار ڕێکدەکەوێ کە ڕەچاوکردنی ئەو یاساو ڕێسایانە لە توانادا نەبێ" جا لەو جارانەدا بەشێوەیەکی گشتی دەستم لە چیرۆکەکە دەشت و وازم لێی دەهێنا.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوەش بڵێم کە داهێنانی هونەری لە هەموو حاڵێکدا لەگەڵ یاساو ڕیسای زانستیدا ناسازێ. بۆ نموونە دیمەنی مردنی مرۆڤێك کە خۆی دەرمانخوارد کردووە، مەحاڵە بەهەمان شێوەی کە لە واقیعدا هەیە، نیشانبدرێ، بەڵام دەکرێت ئەو جۆرە دیمەنانە بە ڕەچاوکردنی ڕێساو بنەما زانستییەکان، کەم و زۆر و بە جۆرێ لە تەبیعەت نزیك بکرێتەوە کە خوێنەر یان تەمەشاڤان لە ڕێگەی هەستکردن بە ساختەبوونی دیمەنەکە بزانێ کە لەگەڵ نووسەرێکی بیناو هۆشیاردا سەروکاری هەیە. من لە ریزی ئەو چیرۆکنووسە خەیاڵپەروەرانە نیم کە ڕوو بە رووی بنەما زانستییەکان دەبنەوە، ڕەوتێکی نێگەتیف دەگرنە بەر و حاشاو نکوڵی لە واقیع و ڕووداوە زانستییەکان دەکەن...)).

بە هەر حاڵ چیخۆف وەکو تەمەنی کورت بوو، لەزەتی لە منداڵییەتی خۆیشی نەدیوە. ژیان و گوزەرانی زۆر وشك و ناخۆشبووە، بە خۆی لە پاژێکی نامەیەکیدا بۆ یەکێك لە ڕەخنەگرەکانی ڕوسیا دەڵێت: ((منداڵێتی من لە سۆز بەدوور بوو.. من تاکو ئەمڕۆش وا دەڕوانمە سۆز وەکو ئەوەی شتێکی غەریب بێ، ناباوبێ،... شتێك بێ قەت هەستم پێنەکردبێ..))، هەر چیخۆف لە بەشێکی نامەیەکی دیدا دەڵێت: ((.. لەدایك بووم و گەورە بووم، فێربووم، دەستم دایە نووسین، هەر هەموو ئەم قۆناغانەم لە کەش و هەوایەکدا قەتاند کە زۆر بەداخەوە پارە ڕۆڵێکی گرینگی تێدا هەبوو.. هەڵبەتە ئەم کەش و هەوایە خراپترین کاریان کردە سەر دەرونم..))

چیخۆف لە ساڵی ١٨٨٤دا کۆلیژی پزێشکی تەواو کرد. بۆ ساڵی دوایی و بۆ یەکەمجار خوێنی هەڵهێنا.. بە مەبەستی چارەسەری زۆر شوێنانی کرد، بەڵام کەم و زۆر لە چیرۆکنووسین سارد نەبووەوەو لە دنیای نووسین دانەبڕا.

ئیدی لەمە بەدواوە ساڵ بەساڵ وەزعی تەندروستی خراتر دەبوو ئەوەتا لە نامەیەکیدا بۆ دۆستێکی خۆی دەڵێت: ((... زۆر دەکۆکم، لێدانی دڵم تەواو نییە. دووچاری بەد هەرسیم. سەرم بەردەوام ژان دەکات...))

ئیدی لەسەر داوای دکتۆرەکان لە ساڵی ١٨٩٧دا چوو بۆ باشوری فەرەنسا. بەڵام لە ساڵی ١٨٩٨دا دوای مردنی بابی گەڕایەوە بۆ ڕوسیا و پارچە زەوییەکی لە کریمە کڕی و خانوویەکی تێدا دروستکردو لەوێندەر نیشتەجێ بوو.

لە ساڵی ١٩٠٠دا ئەکادیمیای زانستی ڕوسی شەرەڤ ئەندامێتی دایێ، پاش دوو ساڵ ئەکادیمیای نێو براو شەرەڤ ئەندامێتی بە مەکسیم گۆرگیش دا، لێ حکومەت توڕەبوو، بۆیە ئەکادیمیای ناوبراو ناچار ژێوان بووەوە و بیانووشی ئەوەبوو کە گۆرکی ((سانسۆری سیاسی لەسەرە))، چیخۆفش وەکو کاردانەوە ڕەفزی شەرەڤ ئەندامێتییەکەی خۆی کرد))، کورلینکو - ی ئەدیبش هەمان هەڵوێستی ئەوی وەرگرت.

بە هەر حاڵ ڕۆژ بە ڕۆژ وەزعی تەندروستی چیخۆف خراتر دەبوو. لەگەڵ ئەو حاڵەشیدا لە ساڵی ١٩٠١دا زەماوەندی لەگەڵ (ئۆ لگاکنیپەر))ی ئەکتەردا کرد.

چیخۆف لە ساڵی ١٩٠٤دا بەدەم ئازاری نەخۆشی دەردەباریکەوە ئامادەی یەکەمین شەوی نمایشکردنی شانۆنامەی باخی ئاڵو باڵو بوو، ئامادەبووان چاوەڕوانی ئەمە نەبوون، بۆیە هەر کە وەژوورکەوت، بە هەڵهەڵە و چەپڵە ڕێزانێکی فرە گەرم پێشوازیان کرد.

لە ئەنجامداو لە دوا ساڵانی تەمەندا، نەوەی یەکێك لە کۆیلە ێن زەوی، دەبێت بە خاوەن موڵکێکی گەورە، دیارە ئەم موڵکەی لە کەسوکارییەوە بەمیرات بۆ نەمابووەوە، بەڵکو بەهۆی قەڵەمەکەیەوە دەبێت بە خاوەن موڵك. کە ماڵەکەی دەگوازێتەوە لە ١٨٩٤/٤/٣دا ڕێگەی گوندی میلیکوڤو دەگرێتەبەر، لەوێندەرو لەناو زەوییەکەی خۆیدا خانوویەکی دروستکر کە ١٢٥ ڕۆبڵی تێ چوو.. لە ١٨٩٤/١٠/١٩دا پاش سەفەرێکی خێرا بە بەرلین و پاریس و مۆسکۆدا جارێکی دی گەڕایەوە بۆ میلیکوڤو. چیخۆف زۆر بەرهەمی ئەدەبی لەناو موڵکەکەی خۆیدا دەنووسێت لەوانە (هاوسەرەکەم، دراوسیێ، نەورەس، قاوشی ژمارە شەش) کە ڕووداوەکانی لە خەستەخانەیەکی گوندا ،روو دەدەن و پەیوەندی بە کەڵکەڵە پزیشکییەکانی خۆیەوە هەیە.. بە هەر حاڵ چیخۆف وێڕای وەدەستهێنانی سەرکەوتنی ئەدەبی، هەر دەستبەرداری کاری پزیشکی نەبوو، لێرە، لە لادێداو لە ماڵە تازەکەیدا، نەخۆشان پتر سەریان دەدا.

چیخۆف کە ٢٥ ساڵی تەمەنی لە قەبێڵی نووسین کرد، لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا مافی چاپکردنی بەرهەمەکانی بە ٧٥ هەزار ڕۆبڵ فرۆشت. چیخۆف لە مانگی ١٩٠٤/٥دا لەگەڵ ژنەکەیدا دەچێت بۆ نەخۆشخانەیەکی ئەڵمانیا، کە گەییە ئەوێندەر پاش ٣ هەفتەو لە ١٩٠٤/٧/٢دا لە تەمەنی ٤٤ساڵیدا دوور لە ماڵبات و کەسوکارو دۆستان، لەنێو بێگانان و لە شارێکی غەریبدا سەری نایەوە، جەنازەکەیان بۆ مۆسکۆ هێنایەوە، لەوێندەر لە گۆڕستانی کلێسای (نودویشی) بە خاك سپێردرا.


***سەرچاوەکان:***

*١ - مجموعة آثار **چخوف**، جلداول، داستانهاي كوتاة*
*ترجمة سرواز **استپانيان**، چاپ اول، بهار ١٣٧١*

*٢ - انتون **چخوف** - دشمنان - ترجمة د. سيمين دانشورچاپ ششم ١٣٦١*

*٣ - ولاديمير ناباكوف، درسهايي دربارة ادبيات روس*
*ترجمة فرزانة طاهري، چاپ اول، ١٣٧١*

*٤ - تشيخوف ١٧ /ك٢ / ١٨٦٠ - ١٩٠٤/٧/٢ هنري ترويا - ترجمة: خليل الخوري - مراجعة: د. علي جواد الطاهر.*

*٥ - سلسة اعلام الفكر العالمي تشيخوف بقلم ايليا ايرنبرغ ترجمة: الدكتور ضياء نافع - ط١ ١٩٧٨*

*٦ - النهايات المفتوحة دراسة نقدية في فن انطوان تشيكوف القصصي شاكر النابلسي - المؤسسة العربية للدراسات والنشر ط٢ ١٩٨٥م*

*٧ - ادبيات داستاني قصة، رمانس، داستان كوتاة، رمان جمال مير صادقي -چاپ سوم، بهار ١٣٧٦ -*

٨- داستان و نقد داستان جلد نخست (چاپ سوم) گزیدة و ترجمه احمد گلشیری.

## کاریگەریی چیخۆف

### ورکور

باوەڕ ناکەم تا ئێستا، تەنانەت تاقە یەك ڕۆماننووسی فەرەنساوی هەبووبێ کە بتوانێ بڵێ چیخۆف ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ کاریگەریی بەسەرییەوە نەبووبێ. تەنانەت لە ناو ئەو نووسەرانەشدا کە تاقە دێڕێکی ئەویان نەخوێندووەتەوە یان کەسانی (وەکو من) کە بە بەشێك لە بەرهەمەکانی وی ئاشنان، بە گومانم نووسەرانێك هەبن کە لە شێوەی نووسین یان دەربڕینی هونەرییاندا، قەرزارباری ئەم کەڵە نووسەرەی ڕوس نەبن.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کاریگەری‌و باندۆری بەرهەمەکانی چیخۆف بەسەر ئەدەبیاتی جیهانی هاوعەسری خۆیەوە، زۆر گەورە بووە. نووسەرێکی وەکو کاترین مانسفیلد، لە هەموو بەرهەمەکانی خۆیدا قەرزارباری ئەوە، خەڵکی دیکەش کەم تا زۆر قەرزارباری ئەون. چیخۆف لە دەورانی خۆیدا لە هونەری چیرۆکنووسیدا، شۆڕشێکی بەرپا کرد، چونکە بەدەگمەن نووسەرێك هەیە- بەلای کەمەوە نووسەرانی زندوو و، هاوعەسری ئێمە – کە جۆرە پەیوەندێکی بە نووسەرێك یان چەند نووسەرێکی مەزنی پێش خۆیەوە نەبێت، دڵنیام کە بەلای کەمەوە چەند دڵۆپە خوێنێکی تەنزو ناسکی تەبع‌و تەبیعەتی چیخۆف بە دەماری هەموو ڕۆماننووسانی ئێستادا دەڕوات.

من بەش بە حاڵی خۆم، زۆر چاك دەزانم کە ئەگەر چیخۆف نەبوایە، بەم جۆرەی ئێستام نەدەنووسی. تەکنیکی چیرۆکێکی وەکو (خامۆشی دەریا) هەوێن‌و ماکەکەیم لە ڕۆماننووسانی ئانگلوساکسۆنی سەرەتای ئەم سەدەیەوە (سەدەی بیستەم) واتە (کاترین مانسفیلد، موریس بارینگ، جوزیف کونراد) وەرگرتووە. بەڵام دەبێ لە بەرهەمەکانی چیخۆفدا بۆ هەوێن‌و ماکی بەرهەمەکانی ئەوان، بگەڕێین. هەڵبەتە لێکچوونی بەرهەمەکانی من‌و بەرهەمەکانی چیخۆف، هەر بەو ئەندازەیەیە کە منداڵێك لە یەکێك لە باپیرە گەورە گەورە دوورەکانی بچێت. بەڵام بابایەکی ڕەخنەگر زۆر بەباشی دەتوانێ، ماکی بەرهەمەکانی چیخۆف لە بەرهەمەکانی مندا بدۆزێتەوەو، پێموایە دەکرێت ئەم کارە بە ئاسانی دەرهەق بە زۆربەی ڕۆمانانی هاوچەرخ بکەن.

جا لەم رووەوە، پێویستە هەر یەکێك لە ئێمە وێڕای ستایش‌و ئەوپەڕی قەدرزانیمان، سەبارەت بەچیخۆف هەمان هەستی ڕێزو حورمەتی فرزەندی و باوکایەتیمان هەبێت.

*ورکور.*

## ڤاوشی ژمارە ( ٦ )

(( ١ ))

لە نێو بیناوحەوشی نەخۆشخانەکەدا، ژوورێکی چکۆلەی لاتەریك هەیە کە دەوراندەوری یەکپارچە پنجە دڕکەزی‌و دڕکە ئاسنینەو چەقڵە شینکەو گیاکەڵەیە، دڕووەلانێکە لەو گۆڕە ساپیتە شیروانییەکەی ژەنگن‌و ژەنگگرتوو، دووکەڵکێشی بوغارییەکەی کۆن‌و داڕوخاو، پێبیلەکەکانی شێدارو درز بردوو، قڕێژە بەردو خەنەتیلکە لە درزەکانییەوە سەری دەرهێناوە. گەچکاری دیوارەکانی لە ناوەوە بەری داوە،و بەئاستەم، لێرەو لەوێ شوێنەواری گەچکاریان پێوە ماوە، رووکاری پێشەوەی، روو لە نەخۆشخانەکەیە، بە هۆی تەیمانێکەوە کە بە بزماری دارینی سەر بە قوببە قایم کراوە، لە دەشتەکە جیا دەبێتەوە. تەیمان‌و بزمارەکان کە نووکە تیژەکانیان روو لە ئاسمانە،و تەنانەت ژوورەکەش هەمان دیمەنی شووم‌و نەفرەت ئەنگێزیان هەیە، کە تەنیا لە بینای نەخۆشخانەو زیندانەکاندا دەبینرێت.

ئەگەر لە دڕووان‌و چەقڵە شینکان ناترسیت، فەرموو با لەم باریکە ڕێگایەوە کە دەچێت بۆ ژوورەکە، بڕۆین تا تەمەشایەکی ناوەوەی بکەین. کە دەرگاکە دەکرێتەوە، دەچینە ناو یەکەم دالان‌و ڕاڕەوەوە. لێرەدا، لە پاڵ دیوارەکان‌و لە نزیك بوغارییەکەوە (موغەیری) خەرمانێك لەجلی کۆن‌و شڕ، دۆشەك‌و کۆنە پاڵتۆی شڕ، دەرپێ‌و دیزداشەی خەت خەتی شینباوی بێ کەڵك‌و پێڵاوە شڕی کۆن‌و بێ کەڵك، هەڵدراوەتەوە، ئەم شڕو شیتاڵانە بەستە بەستەو بەچرچ‌و لۆچی‌و تێکەڵ‌و پێکەڵی‌و لە سوچێکدا بەسەریەکا هەڵرژێنراوەو بۆن بۆگەنی دنیای پڕکردووە.

نیکیتای دەرگاوان، کە هەمیشە سەبیلێکی بە دەمەوەیە، لەسەر ئەم شڕەو پڕەیە دادەنیشێت، سیمای زبرو تاوەسووتی، کەپووە سوورەکەی‌و، برۆ چڕو ئاوێزانەکانی، سیمای سەگی پاسەوانی پێدەبەخشێت. پیاوێکە کورتە بالا، باریك‌و بنێس، بەدمجێز، بەلام دەموچاوی دڵگیرو دەستەکانی زەلام‌و بەهێزن. نیکیتا یەکێکە لەو زەلامە خۆشباوەڕو چالاك‌و چەلەنگ‌و کورت بین‌و خڕفانەی کە نەزم‌و تەکووزی لەم دنیایەدا بە هەموو شتێك دەزانن‌و، باوەڕیان وایە کە کوتەك

دەزانیٚ قۆناغ لە کوێیەو، دەبیٚ لە پێناوی بەرقەراری نەزمو تەکووزیدا، لێدانو تەمێکاری بەدەنی بەکارببرێت، بۆیە بیٚ جیاوازی، دەموچاو، سینگو بەرۆك، پشتو خالیگەو هەر شوێنێکی تری لێوە نزیك بێت، پێیدا دەکێشێتو قەناعەتی وایە، بەبیٚ ئەم کارە نەزمو تەکووزی، لەو شوێنەدا بەر قەرار نابێت.

لەویٚ تێپەڕیت، دەگەیتە ژوورێکی گەورە، ئەگەر راڕەو،و دالانەکەی لێدەربکەی، پانتایی هەموو بینایەکە دەگرێتەوە. دیوارەکانی ئەم ژوورە بە بۆیەی شینی تۆخ بۆیە کراوە، تۆزاویو پیسە. میچو ساپیتەکەی یەکپارچە تەنییەو بە باشی دیارە کە بوغارییەکانی (موغەیری) ئەم ژوورە بیٚ دووکەڵکێشن ولە زستاندا دووکەڵ دەکەنو، سیانو تەنی لە سەراپای دەنیشێت. پەنجەرەکانی ناقۆڵان، لە دیوی ناوەوە کەتیبەی ئاسنی ناڕێكو پێکیان بۆ کراوە کە هێندەی دی ناشیرینو بیٚ نموودی کردووە، زەمینەی ژوورەکە کە تەختەیە بۆرو چڵکن، شەقی بردووە. بۆنی کەلەرمی شۆرو ترشاوو دووکەڵی چرای نەوتیو ئامونیاكو نۆشاتر دنیای پڕ کردووە، گەنەو مێشوولە تەراتێنیانە، کە هەوەڵجار ئەم بۆنەت بەسەرا دێت، لە تۆ وایە چوویتەتە باخی گیانلەبەرانەوە.

لەم ژوورەدا چەند تەختە خەوێك بە ریزی یەکەوە دانراوە، هەر یەکەیان زەلامێکی لەسەرە کە بە دیزداشەی شینباوی نەخۆشخانەو، بە کلێتەو شەوکڵاوی مۆد کۆنەوە، دانیشتووە یان پاڵکەوتووە.

تێکڕا پێنج نەفەرن، تەنیا یەکێکیان سەر بە چینی دەوڵەمەندە، ئەوانی دی هەموویان رەشوڕووتی پیشەوەرو کاسبکاران. لەسەر تەختی یەکەم کە رێك بەتەنیشت دەرگاکەوەیە، کەسێکی باریكو بنێسی، سمێڵ سوورو بریقەداری، چاو بە فرمێسك دانیشتووە، سەری لە نێو هەردوو دەستی داناوەو لە پەستاو بیٚ پسانەوە دەڕوانێتە یەك خاڵی بەردەم خۆی. شەوو رۆژ سەر دەجوڵێنیٚ، ئاخ هەڵدەکێشیٚ، بزەیەکی تاڵی بەسەر لێوەوەیەو ئالکاوی خەمو پەژارەیە. بەدەگمەن بەشداری گفتوگۆی ئەوانی دی دەکات، عادەتەن وەڵامی ئەو پرسیارانەش ناداتەوە کە لێی دەکرێن. هەرکاتیٚ خواردنی بدەنیٚ، بیٚ چەندوچوونو بە شێوەیەکی میکانیکی هەڵی دەقوڕێنیٚ. بە کۆکە کورتو دژوارەکەیا، بە گۆنا لاوازو سوور هەڵگەڕاوەکانیا، دیارە کە تازە تووشی نەخۆشی دەردە باریکە (سیل) بووە.

لە تەختەکەی ئەولای ئەوەوە، پیرەمێردێکی کورتە بالای، زیتەڵەو چەڵەنگی، ردێن تیژی قژ رەشی قژ لوولی وەکو قوڵەڕەشان، دەبینرێت. بە رۆژەوە، بە بەر پەنجەرەکانی ژوورەکەدا پیاسە دەکات، یان وەکو تورکان دەستەوئەژنۆ لەسەر تەختە خەوەکەی خۆی دادەنیشێتو پەیتا پەیتا دەجوڵێت، فیکە دەکێشێتو سۆزە دەکاتو نەرمە گۆرانی دەڵێت.

شەوانیش، کاتیٚ بۆ عیبادەتی خوا هەڵدەستیٚ، هەمان شەنگوڵیو شادمانی منداڵانەو زیتەڵەیی بەسیمایەوە دەردەکەویٚ. عادەتی وایە بە مشت دەکێشێت بە سینگو بەرۆکی خۆیدا، قەست دەکات بەسەری قامکان دەرگاکە کون بکات، ئەم پیاوە دێوانە موسای ناوەو جولەکەیە. نزیکەی بیست ساڵێك لەوە پێش، کە کارگەی کڵاودۆزی دەبێت، کارگەکەی گڕ دەگرێتو دەسووتێت، لە حەژمەتاندا تێکدەچێت، شێت دەبێتو بۆ ئەم نەخۆشخانەیەی دێنن.

لە نێو هەموو دانیشتووانی قاوشی ژمارە شەشدا تەنیا رێگە بەو دەدەن لە قاوشەکە بچێتە دەرێ،و تەنانەت لە نەخۆشخانەکەش بچێتە دەرێو لە شەقامەکاندا بسووڕێتەوەو پیاسە بکات. هەڵبەتە سەرچاوەی ئەم ئیمتیازە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم پیاوە لە مێژ بوو وەکو نەخۆشێکی بە درێژاو پێشینەدار،و شێتو دێوانەیەکی ئارامو بێوەی، بە لیبۆكو گاڵتەچی شار ناسرابوو. دەمێ بوو خەڵکی شار بەوە ڕاهاتبوون کە لە شەقامەکانی شاردا، لە نێو کۆمەڵێك منداڵو پۆلێك لە کسۆکاندا ببینن. ئەم پیاوە بە دیزداشەو شەوکڵاوە سەیرەکەیەوە، بە نەعلو سۆلەوە، هەندێجار بە پێی خاوسیو تەنانەت بەبێ دەرپێ لە شەقامەکاندا دەسوڕێتەوە، لەبەر ماڵو دوکانەکاندا دەوەستێو داوای چەند کۆپیکێك دەکات. ئیدی لە شوێنێ کواسی (کۆلا) دەدەنێ، لە جێیەکی دی نان یان چەند کۆپیکێکی پێ دەبەخشن، هەنگێ بەسکی تێرو بەڕکی پڕەوە بۆ قاوشەکە دەگەڕێتەوە. بەڵام هەرچییەك لەگەڵ خۆیدا دێنێ، نیکیتا نەك بە خۆشی بەڵکو بەوپەڕی توڕەیی‌وبە تۆبزی لێی دەسێنێ، بەدەم بە تاڵکردنەوەی گیرفانەکانی دیوانەوە، سوێند دەخواتو خوا بە شایەد دەگرێت کە چیتر رێگەی ئەم جولەکەیە نادات بچێتە دەرێو بە نێو شەقامان بکەوێ. چونکە بەلای ئەوەوە هیچ شتێك لە دنیادا، لە بێ نەزمیو پاشاگەردانی خراتر نییە.

موسیکا(موسا)، پیاوێکی خۆشخزمەتە، حەزدەکات خزمەتی خەڵکی بکات، ئەگەر هاوڕێیانی ژوورەکە تینووبن ئاویان دەداتێ، کە دەنوون، دایان دەپۆشێت، بەڵێنیان دەداتێ کە یەکی چەند کۆپیکێکیان بۆ پەیدا بکات، شەوکڵاوی تازەیان بۆ دروست بکات. بە مراك خواردن بەدەمی ئەو پیاوەی دەستەچەپی خۆیەوە دەکات، چونکە ئیفلیجە. هەڵبەتە ئەم کارە لە ڕووی هاوسۆزی یان هەر ئەنگێزەیەکی دیکەی مرۆڤانییەوە ناکات، بەڵکو زیاتر لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەی گرۆمۆڤە، گرۆمۆڤ یەکێکە لە هاو قاوشەکانی خۆی، کە لە تەختە خەوەکەی دەستە ڕاستیدایە.

ئیڤان دمیتری گرۆمۆڤ، گەنجێکی تەمەن سیو سێ ساڵەیە، لە ماڵباتێکی ڕۆشنبیرە، جاران دادسێنو سکرتێری پارێزگا بووە، پاشان تووشی شێتییەك بووە کە وای هەست کردووە هەمیشە بە دوایەوەنو تاقیبی دەکەن. ئەم پیاوە بە زۆری خۆی گرمۆڵە دەکاتو لەسەر جێگەکەی دەکەوێت یان بە قاوشەکەدا دێتودەچێت، بە دەگمەن دادەنیشێت. هەمیشە پەریشانو نیگەرانە، چاوەڕوانی بویەرو قەوماوێکی چاوەڕوان نەکراوی ترسناکە. چ قورەتە ژاوە ژاوێك لە دالآنەکەوە بێت، یان دەنگو بانگێك لە حەوشەکەوە هەستێ، ملی قوت دەکاتەوە، گوێچکەکانی هەڵدەخات: "تۆ بڵێی لە دووی ئەو هاتبن؟ ئایا تاقیب و سۆراخی ئەو دەکەن؟" لەم کاتانەدا شوێنەواری نارەحەتیو بێزارییەکی نا ئاسایی بە سیمایەوە دەردەکەوێ.

دەموچاوە پانو لاوازەکەی دایمە زەردهەڵگەڕاوە، بە ئاشکرا شوێنەوارو ماکی نەگبەتیو بەدبەختی پێوە دیارە، وەکو ئاوێنەیەك، ئازاری روحیو ترسی هەمیشەیی ئەو، دەنوێنێ. من ئەم پیاوەم خۆش دەوێ، ئەداو ئەتواری نەرمو مایەی سەرنجە، ئەو چرچە باریکانەی کە بە هۆی رەنجو ئازارێکی قووڵەوە کەوتووەتە سیمای، هەستیاریو زیرەکیو هۆشمەندی ئەو دەنوێنێ. پرشنگێکی فێنكو جوان لە چاوەکانیەوە هەڵدەقوڵێت. من ئەم پیاوەم زۆر بەدڵە، چونکە پیاوێکە

لە ڕادەبەدەر بە ئەدەب‌و نەزاکەت‌و بێ فیزو بە سۆزو میهرەبانە، جگە لە نیکیتا، هەموو ئەوانی دی ڕێزی دەگرن. هەرکاتێ دوگمەیەك یان کەوچکێك لەدەستی کەسێك بەربێتەوەو بکەوێتە عاردی، خێرا لە تەختەخەوەکەی خۆی دێتە خوارێ، هەڵی دەگرێتەوەو دەیداتەوە دەستی خاوەنەکەی. هەموو بەیانییەك کە لە خەو ڕادەبێت، ڕۆژ باش لە هاوڕێکانی دەکات و، شەوێش کە دەچووە نێو جێگا شەو باشی لێدەکردن.

ئەم پیاوە تەنیا بە دەموچاو، بەو پەرێشانی‌و نیگەرانییە هەمیشەیی‌و حەرەکاتانەوە کە بە سیمایەوە دەردەکەوت شێت نەبوو،بەڵکو شێتاتی وی زیاتر لە کردارەکانی دیکەیدا دەردەکەوێ، بۆ نموونە هەندێ شەو، دیزداشەکەی توند لە خۆیەوە دەپێچێت‌و جەستەی وەکو بی دەلەرزێت‌و دەکەوێتە دانەچیڕێ، بەلەز بە ناو قاوشەکەدا یان بە بەینی تەختەخەوەکاندا دێت‌و دەچێت. لە تۆ وایە تایەکی توندی لێهاتووە. لە پڕ دەوەستێ، دەڕوانێتە هاوڕێکانی، لە تۆ وایە گەرەکیەتی بابەتێکی زۆر گرینگیان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام زۆری پێ ناچێ، وەك بڵێی هەست بکات کە کەس گوێ لە قسەکانی ناگرێت، یان کەس لێی تێناگات. بە بێزاری‌و بێتاقەتی سەر بادەدات‌و درێژە بە پیاسەکەی خۆی دەدات. وێڕای ئەوەش زوو بە زوو ئارەزووی قسەکردن، بەسەر هەر خولیاو ئارەزوویەکی تریدا زاڵ دەبێت، جڵەو بۆ خۆی شل دەکات‌و بەوپەڕی ئاووتاو و تامەزرۆیی دەکەوێتە قسان. قسەکانی وەکو وڕینەی خەڵکی تا لێهاتوو پچڕ پچڕو زۆرجار نا مەفهوومن. بەڵام وشەکانی‌و، ئاهەنگی دەنگی، مایەی سەرنجی گوێگرن. کە دەکەوێتە قسان‌و گوێی لێدەگریت، هەم بە شێت‌و هەم بە ئاقڵی دەزانیت، هەردوو حاڵەتەکەی تیا بەدی دەکەیت. هەڵبەتە گێڕانەوەو شرۆڤەی قسە وڕێنە ئامێزەکانی وی یەجگار دژوارە. باسی بچووکی‌و دونیەت‌و بێ فەڕی بەشەر، باسی ئەو زۆردارو ستەمکارانە دەکات کە حەقیقەت‌و دادپەروەری پێشێل دەکەن، باسی ئەو ژیانە درەخشان‌و شکۆدارە دەکات کە خەڵکانی ئایندە لەم جیهانەدا دەیانبێت، باسی ئەو پەنجەرە شیشبەندو دەرگا ئاسنانە دەکات، کە هەمیشە گەوجیەتی‌و دڵڕەقی زۆرداران‌و ستەمکاران وەیاد دێننەوە، قسان دەکات‌و قسەکانی هەندێ بەندی گۆرانی ئازادی، هەندێ بەندی ئەو سروودە کۆنانە وەبیر دێننەوە، کە هێشتا تا کۆتایی نە گوتراون.

((٢))

نزیکەی دوازدە —پازدە ساڵێك لەوەپێش، فەرمانبەرێك بە نێوی گرۆمۆف، کە پیاوێکی بەڕێزو دەوڵەمەند بوو، لە شەقامی سەرەکی شاردا خانوویەکی خۆی هەبوو، دەگەڵ خانەوادەکەیدا لەو خانووەدا دەژیان. گرۆمۆف، دوو کوڕی هەبوون بە نێوی سێرگی‌و ئیڤان. سێرگی، لە قۆناغی چوارەمی خوێندنی ئامادەیی بوو کە بە نەخۆشی دەردە باریکە مرد، ئیدی ئەم مەرگە بوو بە سەرەتاو دەستپێکی زنجیرە بەدبەختی‌و نەگبەتیەك کە لە ناکاودا رووی لە ماڵباتی گرۆمۆف کرد. هەفتەیەك دوای مەرگی سێرگی، بابە پیرەکەی بە تۆمەتی تەزویرو پارەدزی گیراو درایە دادگا، زۆری نەبرد، لە نەخۆشخانەی زینداندا بە نەخۆشی تیفۆس (گرانەتێ) مرد. ماڵەکەی‌و هەرچی دارو نەداری هەبوو، خستیانە هەڕاجەوەو ئیڤان دمتریچ‌و دایکی کەوتنە سەر ساجی عەلی‌و هیچ سەرچاوەیەکی رزق‌و رۆزییان نەما.

ئیڤان، تا بابی مابوو، لە زانستگەی پترسبۆرگ دەیخوێندو مانگانە شەست- حەفتا رۆبڵی لە بابی وەردەگرتو بە هیچ کلۆجێ هەستی بە ئاتاجیو نەداری نەدەکرد. لێ نها ناچاربوو ڕەوشو ڕەوتی ژیانی بەتەواوەتی بگۆڕێت. ناچار بوو لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بە کرێیەکی زۆر کەمو ناچیز، دەرسی تایبەتی بڵێتەوە یان سەنەدو دیکۆمێنتان پاکنووس بکاتەوە. وێڕای ئەم هەموو هەوڵو کۆششەش، هەر لە نەداریو برسیەتی نەدەخەلەسی، چونکە هەرچییەکی دەست دەکەوت، بۆ ژیانو گوزەرانی دایکی تەرخان دەکردو بۆ ئەوی دەنارد. ئەنجام ئیڤان دمتریچ، نەیتوانی باری ئەم ژیانە سەختو قورسە ببات، ورەی لەق بوو، خەمو پەژارەیەکی گەورە نیشتە سەر دڵی، زانستگەی تەرك كردو بۆ ماڵ گەڕایەوە. لەوێ، لە شارە چکۆلەکەی خۆیدا، توانی لە رێگەی هەندێ دۆستانی دەستڕۆوە، بە مامۆستای سەرەتایی دابمەزرێت. بەڵام هەرچی دەکرد دەگەڵ هاوکارەکانیا نەدەسازاو نەیدەتوانی دڵی قوتابیەکان بۆ خۆی ڕاکێشێت، بۆیە زوو بە زوو دەستبەرداری ئەم کارەش بوو. دایکی مرد، نزیکەی شەش مانگێك بێ کار بوو، بە درێژایی ئەو ماوەیە خواردنی نانی وشكو ئاو بوو، تا ئەنجام لە دادگای شاردا بە پلەی سکرتێر دامەزراو تا لەبەر نەخۆشی دەریان نەکرد، هەر لە هەمان پۆستدا مایەوە.

ئیڤان هیچ کاتێ، تەنانەت بە قوتابیەتیش کەسێکی ساغو سەلامەت دیارنەبوو. هەمیشە کەسێکی رەنگزەردو لاواز بوو، بەکەمترین سەرما نەخۆش دەکەوتو تووشی پەسیڤ دەبوو، خواردنی کەم بوو، خەوی باش نەبوو. بە پێکێ شەراب سەرەگێژکەی پێدەکەوتو دەکەوتە بزرکان، زۆر حەزی دەکرد، پەیوەندی دەگەڵ دۆستو ئاشنایاندا ببەستێ، لێ بە هۆی بەدگومانیو بەدمجێزی خۆیەوە، نەیدەتوانی دۆستایەتی نزیكو ڕاستەقینە دەگەڵ هیچ کەسێکدا بکات. زۆر بە خراپی باسی خەڵکی شاری دەکردو بە سووکی تەمەشای دەکردن، دەیگوت جەهلو نەزانیو ژیانی حەیوان ئاساو سستو خەواڵویان، پەستو بێزاری دەکەنو مایەی نەفرەتەو، نزمو سووكو بازاڕی دێنە بەرچاوی. دەنگی بەرزو تیژ بوو، هەمیشە یا بە دەنگی ڕەساو هێواش یا بە دەنگی گەرمو گوڕو ئاشوفتەو شڵەژاو قسانی دەکرد. قسەکانی هەمیشە راشکاوو راستگۆیانە بوون، باسی هەر شتێکت دەگەڵدا بکردایە ئەنجام سەری قسەکەی دێنایەوە سەر بابەتە دڵخوازەکەی خۆی کە:

"ژیان لەم شارەدا ناخۆشو تاقەتبەرە، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هیچ ئامانجو بەهایەکی بەرز نییە، ژیانی خەڵکی نادیارو گونگو ئاڵۆزو بێ ئامانجە. زۆرداریو گەندەڵیو هەلپەرستیو دوو روویيو دەڵەچەیی و ڕووبینی خەڵکی، ژیان دەکوژێت. خەڵکی بودەڵەو بێ ئابڕوو لە خۆشیو ئاسایشدا دەژین. خۆشخۆرو تێرشۆرو پۆشتەو پەرداخن، بەڵام خەڵکانی ئابڕوومەندو داوێنپاك، نانیان بە دۆیان ناگات. نانی وشکیانیش بە ئاسانی دەست ناکەوێت. ئەم کۆمەڵگەیە پێویستی بە قوتابخانانو ڕۆژنامانو شانۆو کتێبخانانی گشتی هەیە، بەو مەرجەی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی تەزویرو قەڵبکاریو درۆو ناپاکیو بێ شەرەف نەیەنە دامەزراندن. پێویستە ڕۆشنبیران وەکو هێزێکی یەکگرتوو لە دەوری یەکدی خڕ ببنەوە. هەڵبەتە دەبێ کارێ بکرێت کە

کۆمەڵگە لە کێماسییەکانی خۆی ئاگادار بێتو هان بدرێ کار بۆ نەهێشتنی کەمو کوڕییەکانی خۆی بکاتو لە ئایندەی ترسناکی خۆی بترسێتو خەمی بخوات."

که دەهاتە سەر باسی خەڵکیو خوو خەسڵەتیان، ئامانی نەبوو، وەکو نیگارکێشێك کە تەنیا ڕەنگێن زەقی سپیو ڕەش بەکار بێنیٚو هیچ ڕەنگێکی دیکە شك نەبات، میانڕەوی نەدەزانی، بە باوەڕی وی خەڵکی دوو دەستە بوون: دەستەی یەکەم ئابڕوومەندو دروستکار بوونو دەستەی دووەم چەپەڵو نەگریسو ناپاك بوون. زۆر بە ئاوو تاو وگەرمو گوڕی باسی ژنانو ئاشقێنی دەکرد، کەچی بە خۆی بۆ تاقە جارێکیش ئاشق نەبوو بوو.

هەر چەندە پیاوێکی توندە تەبیعەتو بەدمجێز بوو، بەڵام خەڵکی شار خۆشیان دەویستو لە پاشملەیان نەدەگوتو بە میهرەبانییەوە پێیان دەگوت : "ڤانیای ئازیز".

روح سووکی، مەیلی خزمەتکردنو بە دەنگەوە چوونی خەڵکی، بە نەزمو زاکوونیەکەی، ئاکار بەرزییەکەی، سەرباری چاکەتە کۆنەکەی و دیمەن وڕواڵەتی ماندوو و،نەخۆشی، ئەو نەگبەتیو بەڵایانەی بە سەر ماڵباتەکەیدا هاتبوون، کردبوویانە کارێك کە خەڵکی بەزەییان پێدا بێتەوەو هاوخەمی دەگەڵ بکەن.

سەرباری ئەمانەش، خوێندەوارێکی تەواو بوو وهاوشارییەکانی باوەڕیان وابوو هەموو شتێکی دەزانیو بەو چاوە سەیریان دەکرد کە قامووسێکی گەڕۆکە. زۆری دەخوێندەوە، زۆربەی کاتی خۆی بە خوێندنەوەوە بەسەردەبرد. بە سەعاتان لە یانەدا دادەنیشتو بە توڕەیی ڕدێنی خۆی رادەکێشاو کتێبو گۆڤارانی تەماشادەکرد. بە دەموچاویا دیاربوو کە بە تامەزرۆییەوە تەماشای وشەکان دەکاتو زیاتر قووتیان دەدات تا بیانخوێنێتەوەو ماناکانیان هەرس بکات. هەموو کەسێك دەیزانی کە خوێندنەوەی لەلا بووە بە خوو و نەخۆشی، چونکە بەهەمان تاسەرباریو تامەزرۆییەوە هەر شتێکی بەر دەست کەوتبا، با رۆژنامەو ساڵنامەی پارش بوایە، دەکەوتە خوێندنەوەی. ئەوەندەی لە ماڵەوەش بوایە، هەمیشەو بە دەم پاڵکەوتنەوە، خەریکی خوێندنەوە دەبوو.

((٣))

بەیانییەکی رۆژێکی پاییز بوو کە ئیڤان دمتریچ، یاخەی پاڵتۆکەی هەڵدابووەوەو بە ناو سیاناو و قوڕاوی گەڕەكو کوچەوکۆڵانان کەوتبوو تاب تەبلیغی دادگا بۆ کابرایەکی کاسبکار کە غەرامەی هاتبووە سەر، بەرێت و بە وەسڵ غەرامەکەی لێوەربگرێت. ئەو بەیانیەش وەکو زۆربەی بەیانیانی دی پەستو خەمبار دەینواند. لە یەکێك لەم لاکۆڵانانەدا رێکەوتی دوو زندانی ی دەست بە کەلەپچەی کرد کە بە چوار سەربازی تفەنگ بە دەست پێشیان دابوون. ئیڤان دمتریچ. بەمجۆرە دیمەنانە، یانی دیمەنی زاندانییان، کە خەمبارو پەشێوو پەریشانیان دەکردو سۆزو بەزەییان دەوڕوژاند، ڕاهاتبوو، بەڵام ئەمڕۆکە دیمەنی زاندانییەکان، کارێکی تایبەتیو سەیریان تێکرد. لە ناکاودا، بێ هیچ هۆیەکی دیار، وای هات بە خەیاڵدا کە لەگینە رۆژێك لە رۆژان ئەویش کۆتو زنجیر بکەنو بە هەمان شێوە، بە کوچەو کۆڵانە قوڕاوییەکاندا، بەرەو زندانی ببەن.

پاش ئەوەی لە نك كابرای كاسبكارەوە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، لە نزیكی پۆستەخانەدا، تووشی موفەتیشێكی ئەمن بوو، كە ئاشنایەتی دەگەڵیا هەبوو. یارۆی موفەتیش پاش چاكوخۆشیو هەواڵپرسی چەند هەنگاوێك لەگەڵیا هات. ئەم رەفتارە بووە بایسی بەدگومانی گرۆمۆف. كە گەییەوە ماڵ، بەدرێژایی ئەو رۆژە، خەیاڵی ئەو سەربازە چەكدارو زندانیانەی لێ دوور نەدەكەوتەوە، ئەم نیگەرانییە دەروونییە كردیە كارێك كە تەركیزی پێ نەكرێتو نەتوانێ بخوێنێتەوە. كە شەو هاتو دنیا تاریك بوو، چراكەی پێنەكرد. تا بەیانی خەو نەچووە چاوانی، بە دەم ئەو بیرو خەیاڵەوە دەتلایەوە كە نەبادا ئەویش بگرنو كۆتو زنجیری بكەنو بۆ زندانی ببەن.

زۆر چاك دەیزانی هیچ تاوانو خەتایەكی نەكردووە، دڵنیاش بوو لە خۆی كە لە ئایندەشدا هەرگیز پەنا بۆ پیاوكوژی وساختەچیاتی، تاوانو دزی نابات. بەڵام باشە ئەگەری ئەوە لە ئارادا نییە پیاو بەبێ ویستی خۆیو لە نەزانستەو بە رێكەوتەكی تاوانێك بكات؟ باشە دەشێت جڵەوی بوختانو ئیفترای درۆزنانو ئەنجام هەڵەو سەهۆی دادگا بگیرێت؟ مەگەر سەدان ساڵە بە تەجرەبە دەرنەكەوتووە كە دەربارزبوون لە هەژاری و بێنەواییو زندان مەحاڵە؟ ئەمە جگە لەوەی دادگاكان بەم ڕەوشو هەلومەرجە كۆمەڵایەتیو رێنماییو یاسایانەی ئەمڕۆیانەوە، زۆر بە ئاسانی دەكەونە هەڵەو سەهووەوە". وەكو چۆن هەرگیز سەیر نییە ئەگەر بێتاوانێ حوكم بدرێت. خەڵكانی وەكو قازیو پۆلیسو پاسەوانانو پزیشكان كە كارەكەیان وا دەخوازێت سەرو كاریان دەگەڵ عەزابو ئازارو بەدبەختیو نەگبەتی خەڵكیدا هەبێت، بەرە بەرەو بە دیتنی ئازارو عەزابان، بەڕادەیەك دڵیان ڕەق دەبێت، كە ئەگەر بەخۆشیان بیانەوێ، ناتوانن جگە لە شێوەی فەرمی رۆتینی، بە هیچ شێوەیەكی دی ڕەفتارو مامەڵە لە تەك تاوانباران و موراجیعاندا بكەنو، لەوەیە لە ڕاستیدا هیچ جیاوازییەكان دەگەڵ ئەو قەسابانەدا نەبێت، كە گاو گۆتاڵان دەكوژنەوەو گوێ بە ڕشتنی خوێنی ئەو گیانلەبەرانە نادەنو زەڕەیەك ڕەحمو بەزەییان بە دڵدا نایەت. جا قازیو دادوەران، بەو رەفتارە بێ بەزەییو رۆتینیانە، بۆ ئەوەی كەسێكی بێ گوناح لە هەموو مافێكی كۆمەڵایەتیو حەیاتی مەحرووم بكەن، و مەحكومی بكەنو بەدەستی جەلادانی بسپێرنو لە گرتووخانەی بێگارەزندانی بپەستن، تەنیا پێویستیان بە كاتی تەواوە تا بتوانن بڕیارو تەشریفاتی غەڵەتو رۆتینی، لە رێگەی مەحكووم كردنی ئەو پیاوە بێ تاوانەوە جێبەجێ بكەن، و بەوە مووچەكەیان حەڵاڵ بكەن، چونكە تەنیا لەسەر ئەوە مووچە وەردەگرن. وەختێ كە ئەم بڕیارو تەشریفاتە پەیڕەوكراو ئەنجام درا، ئیدی تەواو، هەموو شتێك دەبڕێتەوە. هەنگێ كوڕ هەیە بتوانێ لەم شارە چكۆلەو پیسەدا، كە لە نزیكترین مەحەتەی قیتارەوە دوو سەد فرسەخ دوورە، دەنگ هەڵبڕێ، داوای هەقی خۆی بكات، دادخوازی بكاتو بكەوێتە تاقیبی پارێزەرو پشتیوانێك! ئایا لە كۆمەڵگەیەكدا هەموو جۆرە نە هەقیو زۆردارییەك بە ئاساییو لۆژیكیو تەنانەت بە زەروریو پێویست بزانێتو بە هەر كارێكی خێرخوازیو باشو میهرئامێزی، بۆ نموونە وەكو ڕەهاكردنی تۆمەتبارێكی بێتاوانو گوناح، قەڵسو توڕە ببێتو بە ڕقو كینەو

ناڕەزاییەوە پێشوازی بکات، ئایا لە کۆمەڵگایەکی وەهادا دادخوازی‌و هەق جۆیی کارێکی کۆمیدی نییە؟

ئیڤان دمتریچ، هەر چۆنێ بوو ئەو شەوەی ڕۆژکردەوە ، بەیانی بەترس‌و لەرزێکی زۆرەوە لە خەو رابوو، ئارەقەیەکی سارد نیشتبووە سەر هەنیەی. ئیدی بە تەواوەتی لەوە دڵنیا بوو کە هەر ساتێ بیگرن دەیگرن، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "مادامێکی ئەو خەیالات‌و بیرۆکە تاریکانەی دوێ شەو بەرۆکی بیریان بەر نەداوم، کەواتە گومانی تیا نییە کە دەبێ ماکێکی ڕاستییان تێدابێ. دەنا هیچ ماقووڵ نییە ئەو خەیاڵ‌و بیرانە بەمێشك‌و خەیاڵدانی مندا بێن."

پاسەوانێك بە کاوەخۆ بە بەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا تێ دەپەڕێ. بێگومان مەبەستێکی هەیە، ئەم کارە بێ مەلامەت نییە. دوو زەلام لەبەر ماڵەکەیدا، بە کڕی‌و بێدەنگی دەوەستن، بۆچی بێدەنگن؟.

لەوە بە دواوە، ئیڤان دمتریچ نە شەوی شەو بوو، نە ڕۆژی ڕۆژ، ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرا، هەر کەسێك بە بەر پەنجەرەی ماڵەکەیدا تێپەڕیبا، یان پێی نابایە حەوشەکەی بە جاسوس‌و ئەمنی دەزانی. ئەفسەری بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی ناوچەکە، هەموو ڕۆژێ لە کاتی نیوەڕۆدا بە گالیسکە دوو ئەسپییەکەی، لە باخ‌و موڵکەکەی خۆیەوە، کە لە دەرێی شار بوو، بەو شەقامەدا، کە ماڵەکەی ئیڤان دمتریچی لێ بوو، دەگەڕایەوەو بۆ دایەرەی ئاسایش دەچوو. لێ ئیڤان دمتریچ هەر کەڕەتێ کە ئەوی دەبینی و سیمای لەبەر چاویا جۆرێکی دەنواندو گالیسکەکەی زۆر خێرا داژۆت، وای وێنادەکرد بۆیە پەلەیەتی تا ئاسایش ئاگادار بکاتەوە کە تاوانبارێکی زۆر ترسناك لە شاردایە. ئیڤان دمتریچ، وای لێهات لە دەنگی هەر زەنگ‌و تەقولبابێك ڕادەچڵەکی‌و ترسی لێدەنیشت. هەر کاتێ خاوەن ماڵەکە میوانێکی هاتبا کە ئەم نەیناسیبا، تەواو دەپەشۆکاو قوشقی دەبوو. کە تووشی پۆلیسێك یان پاسەوانێك بوایە، بە درۆوە بزەی لە خۆ دێناو دەکەوتە فیکە لێدان تا خۆی بێ منەت‌و بێ خەم‌و خەیاڵ‌و ترس بنوێنێ. بە درێژایی شەو، لە ترس‌و بە خەیاڵی ئەوەی هەر ساتێ بدەن بە سەریاو خانەبگیری بکەن، نەدەخەوت، بەڵام بە دەنگی بەرز دەی پرخاندو هەندێجار هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا تا ژنەی خاوەن ماڵ، وا وێنا بکات کە گوایە نوستووە. چونکە وای خەیاڵ دەکرد کە ئەگەر خاوەن ماڵەکە بزانێت ئیڤان دمتریچ بە شەوان ناخەوێت، بێگومان هۆی خەو زڕان‌و بێ خەوییەکەی دەگێڕێتەوە بۆ عەزابی ویژدان‌و ئازاری دەروون. ئەوجا نۆبەتی ئەو قەوانەیە! حەقیقەت‌و بیرکردنەوەو لۆژێکی دروست قەناعەتیان پێ دێنا کە هەموو ئەم ترس‌و نیگەرانییەی ئەو، شتێکی بێهودەو بێ بنج‌و بناوانە. ئەوە ساغ بووەتەوە کە کەسێك ویژدانی ئاسوودە بێت، پێویست ناکات هیچ ترسێکی لە گرتن‌و حەپس هەبێت. بەڵام تا ئاقڵانەترو واقیعبینانەترو لۆژیکیانەتر بیری دەکردەوە، نیگەرانترو شپرزەتر دەبوو. کێشماکێشی دەروونی ئەو، لە کاری پیاوێك دەچوو کە بیەوێ بە تاقی تەنیا درەختانی بێشەیەکی چڕە دارستان ببڕێتەوەو تا زیاتر هەوڵبدات‌و تەور بوەشێنێ، درەختەکان زیاد بکەن کەم نەکەن. کاتێ ئیڤان دمتریچ بۆی دەرکەوت ئەم کێشماکێشە دەرونییەی ئەو بێ سوودو ئاکامە، ئیدی وازی لە بیرکردنەوە هێناو خۆی بە ترس‌و نائومێدی سپارد.

بەرە بەرە کەوتە گۆشەگیریو دوورەپەرێزی لە خەڵکی. جاران کە لە کاروخزمەتی فەرمی حکومەتی بێزار بوو، ئێستا لێی بوو بوو بە کۆڵێ شێرو لە ژێریا دەری نەدەبرد. لەوە دەترسا، داوێکی بۆ بنەنەوەو فریوی بدەن: بۆ نموونە بەبێ ئەوەی پێ بزانێت پارەیەك بخەنە گیرفانییەوەو پاشان بە بەرتیلخۆری تۆمەتباری بکەن یان بە خۆی لە نووسینی نامە ئیدارییەکاندا، لە نەزانستە هەڵەیەك بکاتو ئەمەی لێ بکەن بە تەزویرکردنی بەڵگەنامەی حکومەتی، یان پارەی ئەو خەڵکانەی کە بە ئەمانەت بەوی دەسپێرن، ون بکاتو بە تۆمەتی ساختەچیاتیو دزی بکەونە تاقیبو سۆراخی، سەیر ئەمە بوو کە پێشتر هیچ کاتێك وەکو ئەمڕۆ، هەر سەعاتەی هەزارو یەك داڵغەی بەمێشکدا تێ نەدەپەڕی کە نەبادا ئازادییو ئابڕووی لەکەدار ببێت. هەرگیز بە ئەندازەی ئێستا پەریشانو پەشێو نەبووە. ئەم داڵغەو نیگەرانییە، بە ئاشکرا پەیوەندی وتەماسی ئەویان بە دنیای دەرەوە کزو کەم دەکرد، ئیدی ئارەزووی خوێندنەوەی نەبوو، بەرە بەرە زاکیرەی لە دەست دەداو دەیدایە کزی.

لە رۆژێکی سەرەتای بەهاردا، کە بەفرێکی قورس کەوتبوو، لە کەندێکی کەناری گۆڕستانەکەدا، دوو جەنازەی کۆن دۆزرایەوە. یەکێکیان هی پیرەژنێكو ئەویتریان هی منداڵێکی بچووك بوو کە شوێنەواری مەرگی نائاسایی بەهەردوو جەنازەکەوە دیاربوو. ئیدی باسی دۆزینەوەی ئەم جەنازانەو هەبوونی بکوژێکی نە ناسراو لە شاردا بوو بە وێردی سەر زاران. جا ئیڤان دمتریچ بەو مەبەستەی کە خەڵکی گومان لەو نەکەنو ئەو بە بکوژ نەزانن، بە شەقامو جادەکاندا دەسوڕایەوەو بزە لە لێوانی نەدەبڕا، بەڵام هەرکە ئاشنایەکی دیتبا، ڕەنگێکی دێناو ڕەنگێکی دەبردو هەوڵی دەدا بۆی بسەلمێنێ کە لە دنیادا هیچ تاوانێك لە کوشتنی خەڵکی سڤیلو بێ دەسەڵات نامەردانەتر نییە. بەڵام زوو بە زوو لەم درۆبازیە بێزارو بێتاقەت بوو، دوای ماوەیەك بیرکردنەوە لێبڕا کە باشترین شت ئەوەیە خۆی لە ژێرخانی خاوەن ماڵەکەیدا وەشێرێت، شەوێكو دوو رۆژان لە ژێر خانەکەدا مایەوە! خەریك بوو لە سەرما ڕەق هەڵێ، رۆژی سێیەم کە دنیا تاریکی کرد، وەکو دز، بە نهێنی بۆ ژوورەکەی خۆی، دزەی کرد. بێ ئەوەی لە جێی خۆ ببزوێ تا بەیانی لە نێو ژوورەکەدا بەدەم ڕاوەستانەوە، گوێی بۆ هەر دەنگێك هەڵدەخستو بە بچووکترین دەنگ گوێ قوڵاغ دەبوو، بەیانی زوو، پێش خۆرکەوتن، چەند سۆپاسازێك خۆیان بە حەوشەدا کرد، ئیڤان دمتریچ زۆر چاك دەیزانی کە هاتوون بوغاری بۆ موبەقەکە دابنەن. لێ ترسو وازوازی دەروونی پێی دەگوت هەبێو نەبێ ئەمانە ئاسایشنو خۆیان گۆڕیوەو جلی بوغاری سازییان لەبەر کردووە. بەخشکەییو بێئەوەی فریابکەوێ کڵاوو پاڵتۆکەی لەبەر بکات، لە حەوشە وەدەرکەوت، هەرکە گەییە سەر جادەکە دەستی بەڕاکردن کرد. سەگو کسۆکان بە دەم حەپینەوە دووی کەوتن، کابرایەکی دێهاتی لە دواوە هاواری لێدەکرد، وژە وژی با لە گوێیدا دەنگی دەدایەوە. بەڵام ئیڤان دمتریچ وای وێنا دەکرد هەر هەموو هێزی دنیا دوای ئەو کەوتووەو تاقیبی ئەو دەکەن.

ئەنجام چەند کەسێك گرتیانەوەو بۆ ماڵیان هێنایەوەو خاوەن خانووەکەی ناردی بە شوێن دکتۆردا. دکتۆر ئاندرێ ییفیمیچ، کە پاشان بە دوورو درێژی دێمە سەر باسی ئەویش، هاتو

دەستووری دا کە پەڕۆی تەڕ لەسەر سەری دابنەن و ئاوی گەڵای مۆرتکی دەرخوارد بدەن. پاشان بەداخ و کەسەرەوە سەرێکی باداو ڕۆیی، لە کاتی ڕۆییشتنەکەیدا بەخاوەن ماڵەکەی گوت کە چیتر بە دوویدا نەنێرێت، چونکە کابرا بەرەو شێتی دەڕوات و، نابێ ئەزیەت و ئازار ببینێ. جا چونکە ئیڤان دمتریچ، پارەی ژیان و مەسرەفی عیلاجی نەبوو، بۆ نەخۆشخانەیان برد، لە قاوشی نەخۆشانی دەروونی، خەواندیان. شەوان نەدەخەوت، بیانووی دەگرت و نەخۆشەکانی دیکەی ناڕەحەت و بێزار دەکرد. دوای چەند ڕۆژێك بە دەستووری دکتۆر ییفیمیچ، بۆ قاوشی ژمارە شەشیان گواستەوە.

ساڵێك بوری، خەڵکی، ئیڤان دمتریچ-یان لە بیرچووەوە. بەڵام کتێبەکانی، کە خاوەن ماڵەکە، هەڵی ڕشتبوونە ناو سەندوقۆکەیەکەوەو لە دالآنەکەدا دای نابوون، هەر هەمووی مندالآنی گەڕەك بردیان.

((٤))

وەکو پێشتر گوتم، هاوتەختی دەستەچەپی ئیڤان دمتریچ، موسیکای جولەکە بوو، بەڵام هاوتەختی دەستەڕاستی دێهاتیەکی قوت و قەڵەوە، دەموچاو سپیەکەی بە ئاشکرا شوێنەواری بێ فیکری و بێهوشی تەواوەتی پێوە دیارە، ئەم حەیوانە تەمەڵ و چەپەڵ و چڵێس و زۆر خۆرە، لە مێژە توانای هزرین و هەستکردنی لە دەستداوە. دایمەی خوا بۆنێکی کەسکون و ناخۆشی لێدێت.

نیکیتا، کە پەرستاری ئەو پیاوەی پێ سپێردرا بوو، بێ ئەوەی بەلای کەمەوە بەزەیی بە دەستەکانی خۆیدا بێتەوە، زۆر خراپی لێدەدات. لێدانەکەی نیکیتا زۆر گرینگ نییە، چونکە لەگینە بابەیەکی گوندی بەو جۆرە لێدانە ڕاهاتبێت، بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە ئەمەیە کە ئەم بوونەوەرە گەوج و کەودەنە لەهەنبەر بۆکسەکانی نیکیتادا نە فزەیەك نە جوڵەیەك ناکات، بەڵکو تەنیا وەکو بەرمیلێکی قورس، لەسەر تەختە خەوەکە گینگڵێك دەدات و هیچی تر.

پێنجەمین و دوایەمین نەفەری قاوشی ژمارەی شەش، خزمەتگوزاری دایەرەیە، کە پێشتر کاری پۆستەبەری کردووە، پیاوێکی کورتە باڵای سیسەڵەی موو زەرد. جووتێ چاوی میهرەبان بەڵام فێڵاوی هەیە. بە چاوە ئارام و زیتەڵ و پرشنگدارو روونەکانیا، کە بە شادمانی دەڕوانێتە دەوروبەر، وادیارە کە نهێنییەکی زۆر گرنگ و خۆشی لە دڵی خۆیدا حەشارداوە. هەمیشە شتێك لە ژێر دۆشەکەکەی خۆیدا دەشارێتەوە، ئەم کارەی لە ترسی ئەوە نییە کە نەبادا شتەکەی لێ بدزن یان لێ بڕفێنن، بەڵکو لەبەر شەرمنی خۆی ئەو شتە بە هیچ کەسێك نیشان نادات. هەندێجار دەچێتە بەر پەنجەرەکە، پشت دەکاتە هاوڕێکانی، شتێك بە بەرۆکی خۆیەوە دەکات، سەر دادەنەوێنێت و تەمەشای دەکات. ئەگەر لەم کاتەدا کەسێك لێی نزیك ببێتەوە، یەکسەر دەپەشۆکێ و شپرزە دەبێت و ئەو شتەی کە لە بەرۆکی خۆی داوە، لە ناو دەستیا دەشارێتەوە، هەڵبتە پەی بردن بە نهێنییەکانی وی کارێکی زۆر ئەستەم نییە.

زۆرجار روو دەکاتە ئیڤان دمتریچ ودەڵێت:

– پیرۆزباییم لێبکە! بۆ میداڵی (ستانیسلاڤ ئەستێرەداری نمرە دوو)،کاندید کراوم. میداڵی نمرە دووی ئەستێرەدار تەنیا بە فەرەنگیان و بێگانان دەدرێت، بەڵام لەبەر هۆیەکی تایبەتی منیان لەو مەرجە بواردووە.

ئەوجا بەدەم بزەوە، بەسەر سامی شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و لەسەری دەڕوات و دەڵێت:

– پیاو راست بڵێ چاوەڕوانی ئەو رێزو قەدرزانیە نەبووم.

ئیڤان دمتریچ، بە پەستی و گرژی وەڵام دەداتەوە:

– من سەر لەم شتانە دەرناکەم.

لێ کۆنە پۆستەبەر، چاوە مەکراوییەکانی بچووك دەکاتەوەو لەسەر قسەکەی خۆی دەڕوات و دەڵێت:

– دەزانی کە لە ئایندەی نزیکدا، بە چ میداڵێك موشەرەف دەبم؟ ئەسەح میداڵی (ئەستێرەی قوتبی)م دەدەنێ، ئەو میداڵە هەموو زەحمەتێك دێنێ، خاچێکی سپیە بە نەوارێکی رەشەوە... میداڵێکی زۆر جوانە.

ئەلهەقی ژیان لە هیچ شوێنێکی دیکە، وەکو ژیانی ناو قاوشی شەشەم، یەکهاوی و ناخۆش و تاقەتبەر نییە. بەیانیان جگە لە دوو کەس، پیرەمێردەکەو دێهاتیە قەڵەوەکە، هەموو نەخۆشەکان دەچنە دالانەکەو لە کوڵە ئاوێکی گەورەدا دەست و دەمو چاویان دەشۆن و بە داوێنی جبەکانی بەریان دەست و دەموچاویان وشك دەکەنەوە. دوای ئەوە لە کوپی تەنەکەدا چای دەخۆنەوە. نیکیتا، لە بینا سەرەکییەکەی نەخۆشخانەکەوە چایان بۆ دێنێ و یەك کوپ چای بە هەر یەکێکیان دەدات. نیوەڕوان سوپ و شلەی کەلەرمیان دەدەنێ، ئێواران پاشمەنەی خواردنەکەی نێوەڕۆیان دەدەنێ. باقی کاتەکان دەخەون، لەسەر جێگاکانیان پاڵدەکەون، لە پەنجەرەکەوە تەمەشای دەرێ دەکەن، بە ناو قاوشەکەدا پیاسە دەکەن. ئیدی ئەمە بەرنامەی هەموو رۆژێکیانە. تەنانەت کۆنەپۆستەبەرەکەش هەمیشە باسی میداڵ و نیشانەکانی خۆی دەکات و دەکاتەوە.

لە قاوشی ژمارە شەشدا بەدەگمەن کەسێکی تازە دەبینرێ. دکتۆر دەمێکە دەستووری داوە کە نەخۆشانی تازە وەرنەگرن. ئەمە جگە لەوەی ژمارەی ئەوانەی کە دەیانەوێ سەری شێتخانان بدەن، لە هەموو دنیادا هەر کەمە. (سیمیون لازاریچ)ی بەربەر هەردوو مانگ جارێك سەری قاوشی ژمارە شەش دەدات. هەڵبەتە باسی ئەوەی کە ئەم بەربەرە چۆن سەری نەخۆشەکان چاك دەکات و، چۆن نیکیتا یارمەتی دەدات و هەروەها چۆن کاتێ نەخۆشەکان چاویان بەم بەربەرە خەنۆل و خەندەران و مەستە دەکەوێ دەهاڕوژێن و زارە تەرەك دەبن، شتێکی زیادەو پێویست ناکات.

جگە لە بەربەرەکە کەسی دی بۆ ئەم قاوشە نایەت. بۆیە نەخۆشەکان مەحکومن بەوەی هەموو رۆژێ تەنیا سیمای نیکیتا ببینن و تەواو. بەڵام دەنگۆیەکی سەیر لە نەخۆشخانەکەدا داکەوتووە، دەڵێن گوایە دکتۆرەکە کەوتووەتە هاتوچۆی قاوشی ژمارە شەش و بە بەردەوامی سەری نەخۆشەکان دەدات.

ئەلهەقی دەنگۆیەکی سەیر بوو!

دکتۆر ئاندریێ یفیمیچ راگین، لە پێستی خۆیدا پیاو وپیاوانە دیار بوو. دەڵێن لە تاقی لاویدا زۆر بە دین بووەو حەزی کردووە بچێتە سنفی ڕۆحانیانەوە، کە لە ساڵی ١٨٦٣دا خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووە، بە نیاز بووە بچێتە ئەکادیمی زانستە ئایینییەکان، بەڵام بابی پزیشكو جەڕاح بووە، زۆری گاڵتە پێکردووەو بە ئاشکرا پێی گوتووە کە ئەگەر بچێتە ناوەندەی ڕوحانیانو ببێ بە قەشە ئەوا حاشای لێدەکاتو بە کوڕی خۆیی نازانێت. من نازانم ئەم قسەیە تا چەند ڕاستە، بەڵام زۆر جار بەخۆم لە (ئاندریێ ییفیمیچ)م بیستووە کە گوتوویەتی کە قەت رۆژێ لە رۆژان هەستی نەکردووە حەزی لە دکتۆری و زانستێن پزیشکی بێت. بە هەرحاڵ پاش تەواو کردنی کۆلیجی پزیشکی نەبوو بە کەشیش. لە سەرەتای ژیانی دکتۆریشیدا، خووی نەدایە دینداریو هەروەکو ئەمڕۆکە لە کابرایەکی ڕۆحانی نەدەچوو.

بە ڕواڵەت زیاتر لە فەلاحێکی تۆکمەو زبر دەچوو. سەرو ریشی زبرو قەدو قەڵافاتی تۆکمەو دزێوی، مەیخانەچیانی گۆساخو بێ ئەدەبی بەینی جادەکانی وەبیر پیاو دێناوە. دەموچاوی زبرو یەکپارچە دەماری شین بوو، جووتێ چاوی چکۆلەو کەپوویەکی سووری پێوەبوو. زەلامێکی کەتەی باڵا بەرزی ناوشان پان، دەستو مەچەك قەویو ئەستووری ئەوتۆ بوو، وات وێنا دەکرد ئەگەر مستێك بە هەر کەسێکدا بکێشێت، ڕوح دەرنابات. بەڵام زۆر ئارام بوو، بە پارێزو سڵکردنەوە رەفتاری دەکرد. ئەگەر لە ڕاڕەوە تەنگەکەی نەخۆشخانەکەدا تووشی کەسێکی دی بوایە، بەو مەبەستەی رێگەیان بکات، دەوەستا، نەك بە دەنگێکی قەبە وەکو تەسەور دەکرا، بەڵکو بە دەنگێکی نزمو نەرمو ناسك دەیگوت: "ببورن!" لوویەکی گەورە بەگەردنییەوە بوو، بۆیە نەیدەتوانی کراسی ملیوان ڕەق لەبەر بکاتو هەمیشە کراسی چیت یان کەتانی نەرمو ناسکی بێ ملشۆی لەبەر دەکرد. یانی بە شێوەیەکی گشتی بە جلو بەرگو پۆشاکیا لە دکتۆران نەدەچوو. دوو دەست جل بەشی دەساڵی دەکرد. ئەگەر جلی تازەی پێویستبایە لە دوکانی کابرایەکی جولەکەی دەکڕی، هەر بە چرچو لۆچی لەبەری دەکردو سەد خۆزگەی بە جلە کۆنەکانی، جلی لێنەدەهات. هەر بەو جلانەوە پێشوازی لە نەخۆشان دەکرد، نانی پێوە دەخواردو دەچووە میوانیش. هەڵبەتە ئەمەی لەبەر پیسکەیی یان هەژاریو نەداری نەدەکرد، بەڵکو زادەی خەمساردی و بێ موبالاتی و بە خۆڕانەگەییشتن و گوێ نەدان بە ڕواڵەتی خوی بوو.

کاتێ کە ئاندریێ ییفیمیچ، بە وەزیفە هات بۆ شارەکەی ئێمە، ئەو (دەزگا خێرخوازییە)ی کە بەو سپێردرا بوو، وەزعو حاڵێکی زۆر خراپی هەبوو. بۆنی بۆگەنی سەعاتە ڕێیەك دەڕۆیی، کوڕم دەویست لە قاوشەکاندا، لە ڕاڕەوەکاندا، لە حەسارو حەوشەی نەخۆشخانەکەدا، بتوانێ لەبەر بۆنی بۆگەنی بە ئاسانی هەناسە بدات. خزمەتگوزارانی نەخۆشخانەکە، پەرستارەکانو منداڵەکانیان، دەگەڵ نەخۆشەکاندا لە یەك شوێن دەخەوتن. هەر هەموو دادو بێدادیان بوو کە بەدەست سیسرکەو پێشکەو ئەسپێو مشکانەوە، حەوانەوەیان لێ هەڵگیراوەو ژیانیان زۆر خراپە.

له سەرانسەری خەستەخانەکەدا تەنیا دوو نەشتەرو یەك قیرات هەبوو. تەشتەکانی گەرماوەکەیان کردبوو بە عەماری هەڵگرتنی پەتاتە. پاسەوان‌و جل شۆرو پزیشکیاری نەخۆشخانەکە، هەر هەموویان دزییان لە نەخۆشەکان دەکردو تەماحیان دەکردە خۆراکی وان، سەبارەت بە دکتۆرەکەی پێشوو، یانی ئەوەی پێش ئاندریێ ییفیمیچ، بە دزییەوە کحول‌و سپرتۆی نەخۆشخانەکەی دەفرۆشتەوەو لە سیستەران‌و ژنانی نەخۆش، حەرەمسەرایەکی تەواوی بۆ خۆی دروست کردبوو. خەڵکی شار بە باشی ئاگایان لەم ئاژاوەو پاشاگەردانیە هەبووو، تەنانەت بە موبالەغەشەوە باسیان دەکرد، کەچی وایان دەنواند هەر ئاگاشیان لیێ نییە. تاقمێك پاکانەیان بۆ سەبەبکارانی ئەم پاشاگەردانییە دەکردو دەیانگوت نەخۆشانی ئەم نەخۆشخانەیە هەر هەموویان لە چینی کاسبکارانی لات‌و لەوێرو خەڵکانی ڕەش‌و ڕووتن‌و، چونکە ژیانیان لە ماڵی خۆیاندا زۆر لێرە خراترە بۆیە نابێ لەم وەزعە نا ڕازی بن. نەخۆشخانە چییان لێ بکات، خۆ کەوو سوێسکەیان دەرخوارد نادات! تاقمێکی دی دەیانگوت لە شارێکی وا بچووکدا چۆن بەبێ کۆمەکێ دەستڕۆو دەوڵەمەندانی ناوچەکە، دەکرێت نەخۆشخانەیەکی تازەو شایستە دروست بکرێت. لەلایەکی دیکەشەوە حکومەت بەم هەنجەتەی کە شارەکە نەخۆشخانەی تیایە، ئامادە نەبوو بچێتە ژێر باری ئەوەی نەخۆشخانەیەکی دیکە لە شارەکەو دەوروبەری شارەکە دابمەزرێنێ.

ئاندریێ ییفیمیچ، پاش ئەوەی گەشتێکی بە ناو نەخۆشخانەکەدا کرد، گەییە ئەو قەناعەتەی کە ئەم نەخۆشخانەیە سەرچاوەی بەد ئاکارییەو زیانی بۆ سیحەتی خەڵکی شار هەیە، قازانجی نییە. یانی خێری نییەو شەڕی بە پای سەگ. بەڕای وی باشترین کار ئەوەیە نەخۆشەکان ئیزن بدرێن‌و دەرگای نەخۆشخانەکە دابخەن. بەڵام کە بیری کردەوە، سەیری کرد ئەم کارە لە لایەکەوە تەنیا لە دەسەڵاتی ئەودا نییەو هەر بە ویستی ئەو نایەتە ئەنجامدان‌و لە لایەکی ترەوە کارێکی بێهودەیە، چونکە ئەگەر نەتوانن نەخۆشی خەڵکی ڕیشەکێش بکەن‌و جڵەوی گەندەڵی ئەخلاقی بگرن، ئەوا بێگومان ئەم نەخۆشیانە بۆ شوێنی دی تەشەنە دەکەن. کەواتە دەبێ سەبر بکرێ تا ئەو نەخۆشیانە خۆ بەخۆ لەناو بچن‌و نەمێنن. لەمەش بترازێ، مادامێکی خەڵکی، ئەم نەخۆشخانەیەیان لە شاردا دامەزراندووەو بەو حاڵەوە پێی قایلن، مانای وایە پێویستیان پێیەتی.

بە قەناعەتی ئەو هەر هەموو ئەم پۆخڵەوات‌و نەگریسی‌و کمی‌و کێماسی‌و بەدئاکاری‌و دەست پیسیانەی کە لەلایەن خەڵکییەوە مومارەسە دەکرێن، زەرورییە، چونکە وەکو ئەو پەینەی کە بە زەوی کشتوکاڵییەوە دەکرێت، ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگۆڕێت‌و دەبێت بە شتێکی بەسوودو پڕ بەها، بۆیە لەم دنیایەدا هیچ شتێکی باش نییە کە سەرچاوەکەی گەندەڵی‌و پۆخڵەوات نەبێت.

بەڵێ ئاندریێ یفیمیچ دەست بەکار بوو، بەڵام بە رواڵەت گوێی لەو ئاژاوەو پاشاگەردانییە نەبوو کە باڵی بەسەر نەخۆشخانەکەدا کێشابوو. تەنیا داوای لە کارمەندان‌و کارگوزاران‌و سیستەرەکان کـرد کـە چـیتر لـە قاوشـی نەخۆشـەکان نـە نـوون، دوو دۆڵابـی بـۆ ئـامێرە پزیشـکی‌و

نەشتەرگەرییەکان جیاکردەوەو لە ژوورەکەی خۆی داینـان. دەرگاوانو سەرپەرشتیارو جلشۆرو پزیشکیارەکەو... وەکو جاران لە شوێنی خۆیان هێشتەوە.

ئاندریێ ییفیمیچ، ئابڕو وشەرەفو دەستپاکی لە هەموو شتێك بەلاوە گرینگتر بوو، بەڵام نە پیاوێکی جددی و بە نەزم وبەزاکون بوو، نە بەو ئەندازەیە باوەڕو متمانەی بە مافو دەسەڵاتەکانی خۆی هەبوو کە بتوانێت ژیان، لە ژینگەی کارەکەی خۆیدا، لە سەر بنەماکانی مرۆڤپەروەریو ئابڕوومەندی، رێك بخات. لەو پیاوانە نەبوو کە بتوانێ ئەمرو نەهی بکات، یان سوور بێ لەسەر ئەنجامدانی کارێك. لە کاتی قسەکردندا، وەکو ئەوەی وەعز دابدا، هەرگیز دەنگی بەرز نەدەکردەوە، فرمانی ئەمری لە قسەکانیا بەکار نەدەبرد، زۆری بەلاوە ئەستەم بوو بڵێ "ئەوەم بدەیە" یان "ئەوە ببە". ئەگەر برسیبایە، بە دوو دڵی کۆکەیەکی بۆ دەکردو بە ئاشپەزەکەی دەگوت: "چۆنە چایەك بخۆمەوە؟" یان "چۆنە نیوەڕۆژە بکەم." بەهیچ جۆرێ زاتی ئەوەی نەبوو بە سەرپەرشتیارەکە بڵێ: "دزی مەکە!" یان ئەم کارە زیادەیە لاببات و ئەم پیاوە مشەخۆرو بێکارە دەربکات. کاتێ خەڵکانێك بە درۆو بە مەبەستی فریودان، مەراییو روپاماییان (ئاندریێ ییفیمیچ)یان دەکرد یان لیستێکی حیساباتی ساختەیان بۆ دێنا تا ئیمزای بکات، لە شەرماندا وەکو کیژانی نەبالق سوور هەڵدەگەڕاو وای هەست دەکرد کە بە تاوانێکەوە گیراوە. لێ وێڕای هەموو ئەوەش لیستەکەی ئیمزا دەکرد، ئەگەر نەخۆشەکان گلەیی ئەوەیان لەلا کردبا کە خواردنەکەیان کەمەو برسیانە، یان کارمەندانو سیستەرەکان دەگەڵیاندا خراپن، دەپەشۆکا، شپرزەو نیگەران وەکو گوناهکاران لە بن لێوانەوە دەیگوت:

- باشە، باشە، بیرێکی لێدەکەمەوە... هەڵبەتە دەبێ هەڵەو سەهویەك ڕووی دابێت..

ئاندریێ ییفیمیچ، لە سەرتاوە بەوپەڕی جددی کاری دەکرد. هەموو رۆژێ لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ پێشوازی لە نەخۆشان دەکرد. کاری نەشتەرگەری ئەنجام دەداو تەنانەت هەندێجار بە کاری مامانیشدا ڕادەگەیی. ژنانو خانمان دەیانگوت دکتۆرێکی چاكو وردو بە ئەزموونو کارامەیەو بەباشی جۆری نەخۆشیان، بە تایبەتی نەخۆشی منداڵانو ژنان، دەست نیشان دەکات. بەڵام دوای ماوەیەك بە هۆی رۆتینیەتو بێهودەیی ئەم کارەوە بە تەواوەتی سارد بووەوە. بۆ نموونە رۆژێك پێشوازی لە سی نەخۆش دەکردو سەیری دەکرد بۆ رۆژی دوایی ژمارەیان بووە بە سیو پێنج نەفەرو بۆ ڕۆژی دواتر بوون بە چل نەفەرو بەمجۆرە ژمارەیان ڕۆژ بە ڕۆژو ساڵ بە ساڵ زیادی دەکرد. نە ڕێژەی مردن لە شارەکەدا کەمی دەکردو نە ژمارەی ئەو نەخۆشانەی سەردانی خەستەخانەیان دەکرد کەم دەبووەوە. چما دکتۆرێك دەکارێت لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ چل دانە نەخۆش بە دروستیو جددی ببینێو دەرمان بکات؟ هەڵبەتە چونکە دەرەقەتی ئەم کارە نەدەهات، ئیدی ناچار بوو، بە پێچەوانەی مەیلو ویستی خۆیەوە، نەخۆشان فریو بدات. یانی بەم پێوەرو پێوانەیە لە ساڵێکدا بەلای کەمەوە، دوازدە هەزار نەخۆشی دەبینی، هەڵبەتە ئاشکرایە کە پێشوازیو دەرمانی دوازدە هەزار نەخۆش یەکسانە بە فریودانی دوازدە هەزار کەسی بێ سووچو بێ گوناح. هەروەها نە ڕێساو رێنماییانو نە زانست رێگەیان نەدەدا نەخۆشانی تازە لە نەخۆشخانەکەدا وەربگرن. چونکە ڕێساو رێنماییانی زۆر

هەبوون‌و هیچ زانستێکیش لە ئارادا نەبوو. خۆ ئەگەر بیەوێ چاوپۆشی لە لایەنی تیۆری‌و فەلسەفی زانستەکەش بکات‌و، وەکو هەموو دکتۆرەکان، کوێرانە تەنیا پەیڕەوی ڕێنماییە ڕۆتینی‌و تەشریفاتیەکان بکات، ئەوا ئەمەش، بەر لە هەر شتێك پێویستی بە تەهویەی دروست‌و پاکی‌و خاوێنییە نەك ئەم پیسی‌و پۆخڵییە. دەبێ خواردنی پاك‌و بە سوود بە نەخۆشەکان بدرێ نەك شۆربای کەلەرمی ترشاوو گەنیو، پێویست بەپزیشکیاران‌و پەرستاران‌و سیستەرانی باش هەیە نەك بە دزو تالانچیان.

سەربای هەموو ئەمانەش، ئەگەر مردن بە کۆتایی ئاسایی‌و سروشتی هەموو گیاندارێك بزانین، ئیدی پێویست بەوە ناکات ڕێ لە مردنی خەڵکی بگرین. گریمان ئەگەر بابایەکی کاسبکار یان کارمەندێکی دایەرە، پێنج ساڵ یان دە ساڵ زیاتر ژیا، چ سوودێك لە ژیانی ئەو بە دەست دێ؟ خۆ ئەگەر مەبەست‌و ئامانجی زانستی پزیشکی لەوەدا ببینم کە دەیەوێ بە زەبری دەرمان، دەردو ئازاران کەم بکاتەوە، لەم حاڵەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشێ بۆچی دەبێ دەردو ئازار سووك بکرێت؟ یەکەم وەکو دەڵێن ڕەنج‌و ئازار، مرۆڤ بەرەو کەماڵ‌و پوختەبوون دەبات‌و، دووەم ئەگەر مرۆڤ بەڕاستی بتوانێت دەردو ئازاری خۆی بە حەب‌و شروبان نەهێڵێ‌و لە ناو بەرێت، ئەوا بە جارێ لە ئاین‌و فەلسەفە، کە تا ئێستا نەك هەر بە بەلاگێڕی هەر بەلاو بەدبەختی‌و نەخۆشییەکی خۆیان زانیوە، بەڵکو بە سەرچاوەی هەموو بەختەوەری‌و خۆشنوودیەکی خۆیانیشیان زانیوە، تەوەللا دەبن. پوشکین لەسەرە مەرگا ژان‌و ئازاری دنیای چەشت، هاینەی داماو چەندین ساڵ بە ئیفلیجی‌و کەفتەکاری لە جێدا مایەوە ئەوسا مرد. باشە چی تییە کە فلان ئاندرێ یفیمیچ یان فیسار ماتریونا سافیشنا کە ژیانێکی بێ ناوەرۆك و بێهودەیان هەیە،وئەگەر دەردو ئازارنەبێت ژیانیان لە ژیانی ئەمیبیا بێ سەمەرو بێهودەتر دەبێت، نەخۆش بکەون و ئازاربچێژن ؟

ئاندرێ یفیمیچ لە ژێر باندۆرو کاریگەریی ئەم جۆرە هزرو هزرینەو، لە سایەی ئەم جۆرە داوەریانەدا، دەستەکانی هەڵدەتەکاندو ڕێی دەکردو وای لێهات زۆربەی ڕۆژان بۆ نەخۆشخانە نەدەهات.

((٦))

بەرنامەی ژیانی ڕۆژانەی بەمجۆرە بوو: بەیانی سەعات هەشت لە خەو ڕادەبوو، خۆی دەگۆڕی، جلکی لەبەر دەکردو چای دەخوارد. هەنگێ یا لە ژوورەکەی خۆی دادەنیشت‌و دەکەوتە خوێندنەوە یان بۆ نەخۆشخانە دەڕۆیی‌و لەوێندەر دەی بینی کە نەخۆشان لە ڕاڕەوە تەنگەکاندا دانیشتوون‌و چاوەڕوانی ئەوەن دکتۆر بیاندینێ. هەروەها خزمەتگوزاران‌و پەرستارانی دەبینی کە بەخشەخشی پێڵاوەکانیانەوە بەملاو بەولادا ڕایان دەکرد، جەندەکی مردووان‌و لەگەنی پیساییان دەبرد، نەخۆشانی ڕەنگ‌و ڕوو سیسەڵەو چرچەڵە بە دیزداشەی خەت خەتەوە ڕێیان دەکرد، منداڵان دەگریان‌و سەرباری ئەو حاڵەش بایەکی توند بە نێو ڕاڕەوەکاندا دەهات. ئاندرێ یفیمیچ چاك دەیزانی کە ئەم وەزع‌و حاڵ‌و ڕەوشە بۆ ئەوانەی گرانەتاو سیلیان بوو، بۆ هەموو ئەو نەخۆشانەی کە نەخۆشیەکانیان سەختەو لاوازو بێ توانان، جۆرێکە لە عەزاب. بەڵام نەیدەزانی چارە چییە؟ کە بۆ نەخۆشخانە دەهات، (سێرگی سیرگیوڤیچ)ی یاریدەدەری دکتۆر،

خێرا، بەپیرییەوە دەچوو ولە هۆڵی پێشوازیدا، خێرهاتن‌و پێشوازی دەکرد. سێرگی سێرگیوڤیچ، پیاوێکی کورتە باڵاو قەڵەو بوو، دەموچاو گۆشتنێکی، ڕدێن تاشراوی پاک‌و خاوین بوو، رەفتار سووک‌و ناشیرین بوو، باڵاپۆشێکی تازەو دەڵبی لەبەر دەکرد، زیاتر لە سیناتۆران دەچوو تا لە پزیشکیاران. لە شارا عیادەیەکی گەورەی هەبوو، بۆینباخێکی سپی لە مل دەبەست، خۆی لە هەر دکتۆرێکی تازەو کەم ئەزموون، بە کارامەترو زاناتر دەزانی. لە سوچێکی هۆڵی پێشوازی نەخۆشاندا، ئیکۆنەیەکی گەورە لە میحرابەکەدا دانرا بوو، فانۆسێکی گەورە لە بەردەمیا دەسووتاو لە نزیکی فانۆسەکەوە، شەمدانێکیان لە سەر مێزێکی چکۆلە دانابوو کە پەردەیەکی سپی پێدا درابوو. هەندێ وێنەی گەورە ئەسقەفان، دەگەڵ نیگاری دێری سفیاتو گورسک‌و تاجەگوڵینەی مێخەکی وشکدا، بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوو.

هەڵبەتە سێرگی سێرگیوڤیچ پیاوێکی بەدین بوو و حەزی لە شکۆو جەلالی ئاینی بوو. ئەم ئیکۆنەیە وهەموو وێنەکانی تری ئەم ژوورە، بە پارەی ئەو کڕدرا بوو و لەوێندەر دانرا بوو. ڕۆژانی هەموو یەك شەممەیەك یەکێك لە نەخۆشەکان بە ئەمرو دەستووری ئەو، لە هۆڵی پێشوازیدا بەدەنگی بەرز بەرز دوعای (ئاکافیست)ی دەخوێندو پاش ڕێو ڕەسمی ئەم دوعاخوانی سروودخوانییە ، سێرگی سێرگیوڤیچ بەخۆی بۆ ژوور بە ژووری نەخۆشخانەکە دەچوو و داری عودی دادەگیرساند.

ژمارەی نەخۆشان زۆرو کات کەم بوو، بۆیە دکتۆر هەر فریای ئەوە دەکەوت چەند پرسیارێکی کورت لە نەخۆشەکان بکات‌و دەرمانێکی سادەی وەکو شەربەتی هازیمە یان ڕۆن گەرچەکی بۆ بنووسێت. ئاندرێ یفیمیچ دەستی دەنایە ژێر چەنەی‌و دادەنیشت‌و بە دەم ئەندێشەو خەیاڵەوە، میکانیکیانە پرسیاری لە نەخۆشەکان دەکرد. سێرگی (سێرگیوڤیچ)ش لە پاڵ ئەودا دادەنیشت، دەستەکانی پێکدا دێناو هەندێجار، بەشداری گفتوگۆی دکتۆرو نەخۆشەکانی دەکردو دەیگوت:

– هەژاری‌و نەخۆشی ئێمە، هی ئەوەیە کە وەکو پێویست خوای دەهەندەو دلۆڤان ناپەرستین، بەڵێ مەسەلەکە ئەوەیە!

ئاندرێ ییفیمیچ، لە کاتی دیتن‌و معایەنەی نەخۆشاندا بە هیچ جۆرێ دەستی بۆ نەشتەرگەری نەدەبرد. لە مێژ بوو کاری نەشتەرگەری تەرك کردبوو، چونکە بە دیتنی خوێن تێك دەچوو. سەری دەسوڕا. کاتێ کە ناچار دەبوو زاری منداڵێك بۆ معایەنەی گەرووی بکاتەوە و منداڵەکە هاواری پێدەکەوت‌و دەگریاو بە دەستە چکۆلەکانی بەرگری لە خۆی دەکرد، بەو هاوارو گریانە سەرەگێژەکەی پێدەکەوت‌و ڕوندك لە چاوانیا قەتیس دەما، بەلەز ڕەچەتەیەکی دەنووسی‌و بەدەست ئاماژەی دەکرد کە دایکی منداڵەکە خێرا منداڵەکەی لە ژوورەکە بباتە دەرەوە.

پێشوازی نەخۆشان‌و شەرم‌و ترس‌و گەوجێتیان، بوونی سێرکی سێرگیوڤیچی دیندارو، نیگارو وێنەو شەمایلانی قەد دیوارەکان، پرسیارە رۆتینییەکانی خۆی، کە بیست دانە ساڵی خشت دووبارەی کردبوونەوە، (ئاندرێ ییفیمیچ)ی بێزراو بێتاقەت دەکرد، بۆیە دوای معایەنەی پێنج شەش نەفەران، هۆڵی پێشوازی بەجێدەهێشت‌و معایەنەی نەخۆشەکانی دیکەی بۆ یاریدەدەرەکەی (پزیشکیار) بە جێدەهێشت.

ئاندریێ ییفیمیچ، لە دڵی خۆیدا مەمنونی خوا بوو کە عیادەی تایبەتی نییەو ئیدی هیچ کەسێك بێزارو بێتاقەتی ناکات، هەرکە دەگەییە ماڵەوە، یەکسەر دەچوو لە پشت مێزی کارکردنەکەیەوە دادەنیشتو دەستی بە خوێندنەوە دەکرد. زۆری دەخوێندەوەو لەزەتێکی لە ڕادەبەدەری لە خوێندنەوە دەبینی. نیوەی مووچەکەی بە کتێبان دەدا، ماڵەکەی شەش ژوور بوو، لەو شەش ژوورە، سیانیان پڕبوو لە کتێبو گۆڤارو کۆنە ڕۆژنامان، زیاتر حەزی لە کتێبی مێژوو و فەلسەفە دەکرد، بۆیە لە هەموو گۆڤارە پزیشکییەکاندا تەنیا گۆڤاری (پزیشك)ی دەکڕی، کە هەمیشە لە کۆتایی گۆڤارەکەوە دەستی بە خوێندنەوەی دەکرد. کە دەستی بە خوێندنەوە دەکرد، بێ ئەوەی ماندوو ببێت، سێ چوار سەعاتی ڕەبەق لەسەر خوێندنەوە بەردەوام دەبوو. بەڵام وەکو ئیڤان دمتریچ، بە پەلەو درشتی نەیدەخوێندەوە، بەڵکو بە ئارامیو وردی موتاڵای دەکرد، زۆرجار لەسەر ئەو بابەتانەی کە بە دڵی بوایەن یان باش لێیان حاڵی نەبوایە، دەوەستاو هەڵوەستەی دەکرد. هەمیشە، لە پاڵ کتێبەکاندا، قاپێ ڤۆدگاو بڕێك خەیارشۆرو قەیسی خوسیاگ، بە ڕووتی لەسەر ماهوتی مێزەکەیدا دەبینرا. هەر نیو سەعات جارێك، بێئەوەی چاو لەسەر کتێبەکە هەڵگرێت، پێکێ ڤۆدگای تێدەکردو هەڵی دەداو ئەوسا بێئەوەی تەمەشا بکات، دەستی بەسەر مێزەکەدا دەگێڕا تا پارچەیەك خەیارشۆر، وەکو مەزە لە زاربنێ.

دەوروبەری سەعات سێ، بە ئەسپاییو بە پارێزەوە بۆ مووبەقەکە دەهاتو بە دوو دڵییەوە نەرمە کۆکەیەکی بۆ دەکردو دەیگوت:

– داریوشکا! وەختی نیوەڕۆژە نییە، دەڵێی چی نانێ بخۆم؟...

ئاندریێ ییفیمیچ، پاش ئەوەی فراڤینێکی زۆر خراپی نیوەکوڵاوی بێ تامی دەخوارد، دەستانی لەسەر سینگی تێك دەئالاندو، بە ژوورەکاندا دەکەوتە پیاسە. جاری وا بوو تاسەعات چوارو پێنجیش بەدەم هزرینەوە هەر پیاسەی دەکرد. جارجار جیڕەیەك لە دەرگای مووبەقەکە دەهاتو دەموچاوە سوورو هەڵاوساوو خەواڵووەکەی داریوشکا دەردەکەتو بە نیگەرانییەوە دەیپرسی:

– ئاندریێ ییفیمیچ! وەختی ئەوە نەهاتووە بیرەیك بخۆیتوە؟!

– نا! هێشتا وەختی نەهاتووە... پەلەم نییە... جارێ....

دەمەو عەسر، (میخاییل ئاڤریانیچ)ی سەرۆکی پۆستەخانە، کە تاقە کەس بوو ئاندریێ ییفیمیچ، لە دۆستایەتیو هاونشینیی بێزار نەدەبوو. دەهات بۆلای. میخاییل ئاڤریانیچ کاتی خۆی یەکێك بووە لە موڵکدارە گەورەو دەوڵەمەندەکانو لە سوپای سوارەدا کاری کردووە، بەڵام دوای ماوەیەك نابووت دەبێتو بە ئاخری پیری لە ئاتاجیدا، لە دایەرەی پۆستەدا دادەمەزرێت. بەسەرو سیمادا بە گوڕو ساغو سەلامەت دیاربوو، ڕدێنێکی چڕی ماشوبرنجی هەبوو، ڕەفتارو ئەتواری جوانو پەسندو، دەنگی نەرمو خۆشو بەرز بوو. هەرچەندە توندە مجێز بوو، بەڵام پیاوێکی دلۆڤانو هەستیار بوو. چ قورەت بوو یەکێك گلەییەك لە دایەرەی پۆستە بکات، یان بە کارێك رازی نەبێت، یان بیەوێ ڕەخنەو ئیرادێك بگرێت، یەکسەر میخاییل ئاڤریانیچ سور دەبووەوە، ئازای گیانی دەکەوتە لەرزینو بە دەنگێکی تەشبریق ئاسا بە ڕوویا هەڵدەشاخی: "بێدەنگ!". بۆیە دایەرەی پۆستەخانە تا ماوەیەکی زۆر بەوە ناوی ڕۆیی بوو کە شوێنێکی

ترسناکە. میخاییل ئاڤریانیچ، بۆیە (ئاندرێ ییفیمیچ)ی خۆش دەویست و ڕێزی دەگرت، چونکە پیاوێکی خوێنەوارو نەفس بەرز بوو. بەڵام باقی خەڵکی شاری، وەکو ئەوەی بەر دەستی ئەو بن، بە گەجەرو گوجەر دەزانی و بە چاوی سووک سەیری دەکردن.

هەرکە خۆی بەماڵەکەی ئاندرێ یفیمیچدا دەکرد، هەر لە ڕێوەو بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد:

– ئەوە منم، سڵاو برای ئازیز! پێدەچێ لێم بێزار بیت! ها؟

دکتۆر بەرسڤی دەدایەوە:

– حەیفت نەکرد، بە پێچەوانەوە زۆر خۆشحاڵم! من هەمیشە بەدیتنی تۆ خۆشحاڵ دەبم.

ئەم جووتە برادەرە ماوەیەك لە ژوورەوەو لەسەر قەنەفەکە دادەنیشتن، بە بێدەنگی سیغاریان دەکێشا. پاشان دکتۆر بانگی دەکرد:

– داریوشکا! چۆنە تۆزێ بیرەمان بدەیتێ.

بوتڵی یەکەمیان بە بێدەنگی دەخواردەوە. دکتۆر لەفکران ڕادەچوو و میخاییل ئاڤریانیچ بە سیمایەکی شادو شەنگوڵەوە وەك بڵێی باسێکی زۆر جوانی پێ بێت. هەمیشە دکتۆر سەری قسەی دەکردەوە، بەدەم سەر لەقاندنەوەو، بێئەوەی بڕوانێتە چاوی بەرانبەرەکەی (قەت نەیدەڕوانییە چاوی بەرانبەرەکەی) بە کاوەخۆ دەیگوت:

– بەڕاستی مایەی داخە... (میخاییل ئاڤریانیچ)ی ئازیز! یانی جێی داخ نییە کە لەم شارەی ئێمەدا بە هیچ جۆرێ خەڵکانێك نەبن کە حەزبکەن یان بتوانن دەربارەی بابەتێکی ئەقڵانی و جوان گفتوگۆو گەنگەشە بکەن. بەڕاستی ئەمە کێماسییەکی گەورەی جڤاکییە. تەنانەت خوێنەوارو رۆشنبیرەکانیشمان، ناتوانن لە باسی بابەتە کۆن و سواوو بازاڕییەکان هێوەتر بچن. من دڵنیات دەکەم کە ئاستی پەروەردەو کەماڵی فیکری ئەوانیش ( ڕۆشنبیرامان)، جیاوازییەکی ئەوتۆی لە هی ڕەمەکی مەردمەگە نییە.

– زۆر ڕاستە! هەق بە تۆیە، منیش دەگەڵ تۆدام.

دکتۆر، بە دەنگە نەرمەکەی، هێدی هێدی لەسەری دەڕۆیی:

– هەڵبەتە تۆش دەزانیت کە لەم دنیایەدا جگە لە دیاردەو دەسکەوتە بەرزەکانی ئەقڵی بەشەری هیچ شتێکی دیکە نە بایەخی هەیەو نە لەزەت. تەنیا ئەقڵە کە بە سەرحەدی نێوان ئینسانیەت و حەیوانییەت دێتە ژماردن، هەر ئەقڵە کە بەشەر دەکات بە گەورەو ئەشرەفی بوونەوەران و دەیگەیەنێتە قۆناغی کەماڵ و پوختە بوون و پایەی خوایەتی و، چونکە وەکو هەموو بوونەوەرانی دی دەمرێت، تا ڕادەیەك نەمرو جاویدانی دەنوێنێ. جا ئەگەر ئەمەمان سەلماندو ئەمە وابێ، ئەوا ئەقڵ دەکاتە تاقە سەرچاوەی لەزەتە بەشەرییەکان. بەڵام چونکە لە دەوروبەری خۆماندا نە خەڵکانی ژیرو ئاقڵ دەبینین و نە گوێمان لە قسەی ئاقڵانە دەبێت، بۆیە لە هەر جۆرە لەزەتێك بێبەشین، ڕاستە ئێمە کتێبان دەخوێنینەوە، بەڵام کتێب جێگەی قسەکردنی زندوو وتێکەڵ بوونی جڤاکی، ناگرێتەوە، زۆریان فەرقە، ئاسمان و ڕێسمانن. جا ئەگەر یارمەتیم بدەیت دەمەوێ لێرەدا بەراوردێك بکەم، هەرچەندە ڕەنگە بەراوردەکەم زۆر دروست نەبێت، بەڵام بە

یارمەتی تۆ دەمەوێ بڵێم ئەگەر کتێبان بە نۆتەی مۆزیك بچوێنین، ئەوا گفتوگۆو قسان دەکاتە گۆرانی.

– زۆر تەواوە، دەقاو دەق وایە.

دوای ئەوە،کەمێك بێدەنگ دەبوون، داریوشکا لە مووبەقەکە وەدەردەکەوت، بە سیمای خەمبارەوە دەستی دەخستە ژێر چەنەی‌و لە ئاستانەی دەرگاکەدا دەوەستاو گوێی بۆ قسەکانی وان هەڵدەخست.

میخاییل ئاڤریانیچ ئاهێکی هەڵدەکێشا:

– ئاه! چاوەڕوانی چی لە هەست‌و ئەقڵی خەڵکیئەم زەمانە دەکەیت!

ئەوسا، دەکەوتە باسی ئەوەی کە خەڵکی جاران چۆن ژیانیان بەخۆشی‌و شادی گوزەراندووە، ژیانیان چەند خۆش‌و بەلەزەت بووە، خوێنەوارو رۆشنبیرانی ئاقڵی جارانی روسیا چۆن بوون‌و چەند بە خەمی شەرەف‌و دۆستایەتیوە بوون. متمانەیان بە یەك دەکرد، بێ هیچ سەنەدو قەواڵەیەك قەرزیان بە یەك دەدا،و لە کاتی پێویستدا یارمەتی یەکیان دەدا، دەستگیرۆیی ئاتاج‌و نەدارایان دەکردو دەست نەگرتنی لێقەوماوانی هاوڕەگەزی خۆیان بە شەرم‌و نەنگییەکی گەورە دەزانی. داب‌و نەریت‌و پەیوەندی‌و دۆستایەتی‌و کردارو گوتیاریان زۆر باش بوو! دۆستایەتیان دەفامی، دۆستی گیانی بە گیانی‌و یەکڕەنگ‌و یەك دڵ پەیدا دەبوون، جا چەند ژنی جوانیان هەبوو! دەڤەری قەفقاز هەر باسی مەکە وڵات بوو نە گاڵتە! ژنی یەکێك لە سەرهەنگەکانی لەشکری مە، کە ژنێکی سەیر بوو، بەبێ رێنوێن‌و بەڵەد، دەیدایە ئەو شاخ‌و کێوانە. خەڵکی دەیانگوت گوایە پەیوەندی ئاشقێنی دەگەڵ میرزادەیەکی گومناوی یەکێك لەو گوندانەی ئەو ناو چیایانەدا هەیە.

داریوشکا ئاهێکی هەڵدەکێشا:

– ئەی دایکی پیرۆزی ئاسمانی!... ئەی مەریەمی پاکیزە.

میخاییل ئاڤریانیچ دوای هەڵوەستەیەکی کەم لەسەر قسەکانی خۆی دەڕۆیی:

– جا خواردن‌و خواردنەوەیان بۆ نالێی! ڕابواردنیان بۆ نالێی! سەفەرو گەڕانیان هەر باس ناکرێ! چ خەڵکانێکی ئازادو ئازا بوون!

ئاندرێ ییفیمیچ، هەر بە رواڵەت گوێی لێدەگرت، دەنا بەدەم بیرە خواردنەوەوە، بیری لە شتێکی دی دەکردەوە، لە پڕ قسەکەی بە میخاییل ئاڤریانیچ دەبڕی‌و هەڵیدەدایە:

– من زۆرجار خەون بەوەوە دەبینم کە دۆستایەتی‌و تێکەڵاوی خەڵکی ئاقڵ بکەم، گفتوگۆو گەنگەشەیان دەگەڵ بکەم. بابم باشی پەروەردە کردووم، بەڵام لە ژێر باندۆرو کاریگەری هزرێن کۆمەڵایەتی باوی ساڵانی ١٨٥٠– ١٨٦٠دا بوو، ناچاری کردم ببم بە دکتۆر، تەسەور دەکەم کە ئەگەر ئەوسا بە گوێی ئەوم نەکردبایە، ئێستا ئەندامی دەستەی مامۆستایانی یەکێك لە کۆلیجە رۆحانییەکان دەبووم‌و لە ناو جەرگەی بزووتنەوە فیکرییەکەدا دەبووم. هەڵبەتە ئەقڵیش ئەبەدی نییە، بەڵکو وەکو هەر شتێکی تری ئەم دنیایە ڕەوتەنیە. بەڵام پێشتر بۆم باس کردوویت کە بۆچی ئەوەندە مایل بە ئەقڵم‌و ئەقڵ دۆستم. ژیان داوێکی بە ئازارە. کە پیاوی هزرڤان‌و بیرمەند

فامی کردەوەو لە ڕووی ئەقڵییەوە پێ گەیی و تێگەیی، خەملێنی ئەقڵی پەیدا کرد، ئیدی خۆی لە ناو داوێکا دەبینێتەوە کە ڕێگەی دەرچوونی نییە. ئەلهەقی مرۆڤ بەبێ ویستی خۆی و لە ئەنجامی زنجیرەیەك ڕووداوەوە، هاتووەتە ئاراوە، هاتووەتە دنیاوە. بۆچی؟ دیار نییە! هەڵبەتە دەیەوێ هۆو ماناو ئامانجی دروستبوونی خۆی بزانێت، یان وەڵامی پرسیارەکانی نادەنەوە یان کۆمەڵێك وەڵامی بێ ماناو تووڕەهاتی دەدەنەوە، لە هەر دەرگایەك بدات، لێی ناکرێتەوە، ئەنجام مەرگ، کە ئەویش بەبێ مەیل و ویستی ئەوە، دەگاتە سەری و قیڕەبڕی دەکات. لەبەر ئەمە وەکو چۆن زندانیان کاتێ دەگەڵ هاوزندانیانی خۆیاندا بە کۆمەڵ ڕێ بکەن، وا خەیاڵ دەکەن کە ئازادترو ئاسوودەترن، بە شەریش بەو ئاوایە ئەگەر لە ژیاندا بکەونە شیکردنەوەو لێکدانەوەی هزری و پێکڤە هەڕنە پێشێ و کاتی خۆیان بە گۆڕینەوەی هزرێن ئازادو بەنرخ بەرنە سەر، ئیدی ئاگایان لە داوەکەی ژیان نامێنێ. جا لەم ڕوانگەیەوەو بەم چەمك و مانایە ئەقڵ و فیکر لەزەتێکی بێ هاوتای دەبێت.

– دەقاو دەق وایە، ڕاستە فەرموویت !

ئاندرێ ییفیمیچ، بێ ئەوەی تەمەشای چاوانی هاونشینەکەی بکات، بە کاوەخۆ، بەهێمنی و، وردە وردە درێژەی بە باسەکەی دەربارەی پیاوانی ئاقڵ و لەزەتی گفتوگۆ دەگەڵ ئاقڵاندا، دەداو (میخاییل ئاڤریانیچ)ش گوێی لێدەگرت و ناو بەناو بە ڕستە باوەکەی خۆی بۆی دەسەلماند:

– دەقاو دەق وایە! ڕاستە فەرموویت!

لە پڕ سەرۆکی پۆستەخانە لێی دەپرسی:

– باشە دکتۆر تۆ باوەڕت بە ژیانی ئەبەدی و جاویدانی ڕوح نییە؟

– نا! میخاییل ئاڤریانیچی ئازیز! "نە باوەڕم پێیەتی و نە هیچ بەڵگەو بیانوویەکم پێیە کە باوەڕم پێ هەبێ."

میخاییل ئاڤریانیچ هەڵدەداتێ و دەڵێت:

– منیش هەرچەند وا هەست دەکەم کە هەرگیز نامرم، کەچی هەر بەینی خۆمان بێت گومانم لە ژیانی ئەبەدی و مانی ڕوح هەیە. زۆرجار بەخۆم دەڵێم دەی پیرەمێری فەرتووتی زۆرهان، بەسە، ئیدی کاتی مردنت هاتووەو دەبێ غەزەلی خوداحافیزی بخوێنیت! بەڵام دەنگێکی کز لە ناخی دڵمەوە بەرسڤ دەداتەوە: "باوەڕ مەکە، تۆ هەرگیز نامریت!".

نزیکی سەعات دەی شەو، میخاییل ئاڤریانیچ هەڵدەستاو دەڕۆیی. کە دەچووە ڕاڕەوەکە، بەدەم لەبەرکردنی پاڵتۆ چەرمە قورسەکەیەوە ئاهێکی قووڵی هەڵدەکێشاو دەیگوت:

– تۆ تەمەشا چارەنووس فڕێی داوینەتە چ گۆشەیەکی دوورە دەستەوە! داخ ئەو داخەیە کە دەبێ لە هەمان شاردا بمرین. ئاخ دنیای بێ وەفا!

((٧))

ئاندرێ ییفیمیچ، پاش ئەوەی دۆستەکەی بەڕێ دەکرد، دووبارە دەگەڕایەوە پشت مێزەکەی و دەستی بەخوێندنەوەو موتاڵا دەکردەوە. هیچ سەدایەك بێدەنگی شەوی نە دەشڵەقاند، بچووکترین سرتە خامۆشی شەوی دەشڵەقاند. پێدەچوو کە زەمانیش وەستابێ تا تەمەشای

دکتۆرو کتێبەکەی بەردەمی بکات کە بەوپەڕی خامۆشیو کڕیو کپی سەری بەسەریا داژەندووە. دەتگوت دنیا جگە لەم کتێبەو لەم لامپا بلور کەسەکە، هیچ شتێکی دی تیا نەبوو. لەم کەشو هەواو هاماجەدا، سیمای زبروسادەی دکتۆر بەرەبەرە دەگەشایەوەو پاراوتر دەبوو،و شوێنەواری شادیو خۆشی لێدەردەکەوت، هەمان ئەو شادیو جۆشو خرۆشە بوو، کە لە سەرەتاو دەستپێکی بزاوتنی فیکرا، بەرۆکی مرۆڤ دەگرێت، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "حەیفیٚ بۆچی بەشەر دەمرێت، بۆچی نەمرو جاویدان نییە؟ باشە ئەم مێشكو ئەم هەموو پێچەلپێچەی مێشك، ئەم هەستی ئەقڵانییە، ئەم نێروی نوتقو دەربڕینە، ئەم سۆز هەستانە، ئەم هەموو بلیمەتیو توانا بەشەرییە لە پای چیو سوودی چییە، کە چارەنووسی ئەوە بێت بفەوتیٚو نەمێنیٚ، هەموو ئەو ئیمتیازانە دەگەڵ جەندەکی ویدا وەژێر گڵی ڕەشەوە بکرێتو بلێونان ساڵ دەگەڵ عاردیدا، بیٚ هیچ مەبەستو ئامانجێك بە دەوری ڕۆژدا بسوڕێتەوە؟ خۆ ئەگەر مەبەست لە دروستبوونو دروستکردنی بەشەر تەنیا ئەمە بوو کە سەرەنجام بمرێتو نەمێنیٚ، هیچ پێویستی نەدەکرد کە بەم هزرو ئیدارەکە بەرزو نیمچە خواییەوە لە نەبوونەوە بێتە بوونو پاشان بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانە، بە نەمانو عەدەمی بسپێرنەوە." . "گۆڕانی بەردەوامی مادە! گوایە ئەمە ئەلتەرناتیفی نەمریو جاویدانییە!، ئەمە ئەوپەڕی ترسنۆکییە بێین بەم هزرە بیٚ مانایانە، بەم تیوریە کۆمیدیەی هەرمان، دڵخۆشی خۆمان بدەینەوە! ئەم پرۆسەی گۆڕانو گۆڕانکارییە، ئەم کارو کاردانەوە لاشعورییەی کە لە تەبیعەدا ڕوو دەدات، لە حەماقەتە بەشەریەکانیش بیٚ بایەخترە. چونکە حەماقەتە بەشەرییەکان هەر چۆنیٚ بیٚ، کەمۆکەیەك هەستوئیرادەیان تیایە، بەڵام لەم ڕووداوو دیاردە سروشتیانەدا نە هەست بەدی دەکرێتو نە ویستو ئیرادە. تەنیا ئەو بنیادەمە ترسنۆكو قەڵەزراوەی کە ترسی مەرگ بەسەریا زاڵ دەبێتو هەموو شەهامەتو پیاوەتییەك لە دەست دەدات، دەتوانیٚ دڵخۆشی خۆی بەم بیرە بداتەوە کە جەستە وی تا هەتا هەتایە لە گیایەکدا، لە بەردێکدا یان لە بۆقێکدا... دەژی. هەڵبەتە ئەم قسەیەی کە گۆڕان خۆی لە خۆیدا جۆرە جاویدانییەکەو هەرمانو ئەبەدیەتی بەشەر دەنوینیٚ، هیچی لەو گاڵتەجاڕیو گەوجێتییە کەمتر نییە، کەسێك دوای شکانو وردبوونی وێڵۆنێکی گرانبەها، پێشبینی ئایندەیەکی گەش بۆ قاڵۆرو قاوغەکەی بکات."

هەر سەرەسەعاتێك کە سەعاتی قەد دیوارەکە زەنگی لێدەدا، ئاندریٚ یفیمیچ پشتی بە کورسیەکەیەوە دەداو چاوانی دەنوقاند، تاباشتر بیربکاتەوە. لە پڕو بیٚ ویستی خۆی دەکەوتە ژێر باندۆرو کاریگەریی ئەو بیرە بەرزانەی کە لە کتێبەکەدا خوێندبوویەوەو چاوێکی بە رابردوو،و ئایندەی خویدا دەخشاندەوە، رابردووی قێزەونو پەشم، دەهاتە بەرچاو، بە شایستەی بیرلێکردنەوەی نەدەزانی. بەڵام سەبارەت بە ئایندە هەستی دەکرد هیچی لە ڕابردوو جیاوازتر نییە. تەسەوری دەکرد لەو دەمەدا کە ڕوحی وی دەگەڵ گۆی ساردو سڕی زەویدا بەدەوری هەتاودا دەسوڕێتەوە، هێشتا هەر خەڵکانی نەخۆشو دەردەدار دەستە دەستە ڕوو دەکەنە ماڵو عیادەی دکتۆران. ڕەنگە لەو زەمانو ڕۆژگارەشدا، دەقاو دەق وەکو ئەمڕۆ نەخۆشان لە تاو ئازارو ژان، خەویان لێنەکەوێت، بەردەوام لە قاوشانی پیسو پۆخڵی

نەخۆشخانەکاندا، لە شەڕی پێشکەو مێرووانـدا بن. لە دنیـای خەیاڵـدا، بە چـاوی خـەیاڵ نەخۆشێکی دەبینی کە سیمای بە دەم ئازارەوە دەگۆڕێت و لە تاو بەستنی توندی زامەکەی دەناڵێنێ. ڕەنگە ئەو رۆژو رۆژگارەش نەخۆشان دەگەڵ پەرستاران و سیستەراندا قومار بکەن و ڤۆدگا بخۆنەوە. رەنگە ئەو سەردەمەش، ئاماری ساڵانە ئەوە نیشان بدات کە دکتۆرێك، دوانزە هەزار نەخۆشی، لە جیاتی چارەسەر، فریوداوە. ڕەنگە لەو زەمان و رۆژگارەشدا، هەموو کاروبارانی نەخۆشخانەکان وەکو ئەمڕۆ بەدزی و ساختەچیاتی، هەڤرکی و ململانێ و فیتنەبازی، دووزمانی و درۆزنی، واسیتەکاری و سەرسەریاتی، بەڕێوە بچن. نەخۆشخانەکان وەکو رابردوو ببن بە بنکەو مەڵبەندی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و بەدئاکاری و زیانۆکی تەندروستی گشتی هاووڵاتیان.

دکتۆر ئاندریێ یفیمیچ زۆر چاك دەیزانی کە نیکیتا لە قاوشی ژمارە شەش دا، لەو دیوی پەنجەرە ئاسنەکانەوە، لە نەخۆشەکان دەدات و هەموو رۆژێ موسیکا جوو، بۆ سواڵ و سەدەقە بۆ ناو شار دەنێرێت.

هەروەها ئەوەشی دەزانێ کە زانستی پزیشکی لەم بیست و پێنج ساڵەی دواییەدا گۆڕان و پێشڤەچوونی چاك و گرینگی بەخۆوە بینیوە. ئاندریێ یفیمیچ کاتێ کە لە زانستگەدا دەیخوێند. وای تەسەور دەکرد کە زانستی پزیشکی بەو زووانە بەهەمان مەرەدی کیمیاگەری و میتافیزیك دەچێت ودەبێ هاوچارەنووسی وان. بەڵام ئەمێستا کە شەوان سەری دەکردە خوێندنەوەو موتاڵا، پێشکەوتن و تەرەقیاتی تازەی دنیای پزیشکی (طب) زۆری کار تێدەکرد،و دڵی پڕ دەبوو لە خۆشی و شادی. لە ڕاستیشدا پێشکەوتن و شۆڕشێکی یەجگار گەورە و سەیر بوو! بە فەزڵی دەرمان و کەشفیاتی تازە، دەکرا نەشتەگەری و عەمەلیاتی ئەوتۆ بکرێت کە خودی پروگۆڤ مەزن تەنانەت لە خەویشدا زاتی نەدەکرد خۆی لە قەرەی ئەم جۆرە نەشتەرگەری و عەمەلیاتانە بدات و، بگرە بە مەحاڵیشی دەزانی. کار گەییوەتە ئەوەی پزیشکانی ئاسایی، بێ ترس و بە ئاسانی عەمەلیاتی کەشکەژنۆ دەکەن، لەو نەخۆشانەی کە عەمەلیات و نەشتەرگەری برینی گەدەیان بۆ دەکرێ، ڕەنگە تەنیا لە سەدا یەکێکیان زایە ببێت، خۆ نەخۆشی بەردی میزڵدان بە رادەیەك ئاسان مالیجە دەکرێت، کە لە گۆڤارانی پزیشکیشدا لەسەری نانووسن. نەخۆشی سیفلیس هەر بە تەواوەتی دەرمان دەکرێت. تۆ تەمەشا تیۆری تازە دەربارەی ویراسەت، هیپنۆتیزم، کەشفەکانی باستوورو کوخ لە کوێ و پزیشکی وڵاتی ئێمە لە کوێ! چ جیاوازییەکی زۆریان هەیە!

نەخۆشیانی دەروونی و جۆرە پۆلێن کراوەکانی نەخۆشی دەروونی و شێوازی دۆزینەوەو چارەسەریان ئەوەندە پێشکەوتووەو گەشەی کردووە کە لەگەڵ جاراندا هەر بەراورد ناکرێت.. ئەمڕۆکە نەخۆشانی ئەقڵی بەو جۆرە مالیجەو دەرمان ناکرێن کە ئاوی ساردیان پێدا بکرێ، بخرێنە بەر ئاوی ساردو، بەخورتی و تۆبزی کراسێن گەرمیان لەبەر ناکەن، وەکو خەڵکانی ئاقڵ و بێ عەیب مدارایان دەکەن و، تەنانەت وەکو لە رۆژنامەکاندا دەنووسرێت، ئاهەنگی شانۆیی و کەڕەنەڤاڵی بالیەو سەرقسیان بۆ ساز دەکەن تا بێزار و بێتاقەت نەبن. ئاندریێ یفیمیچ زۆر چاك

دەیزانی، بە بەراورد دەگەڵ تیۆری و باوەڕو کەشفکاریو سەلیقەی ئێستادا، ئەو کارە دزێوو نەنگینانەی لە قاوشی ژمارە شەشدا دەکرێن، تەنیا لە شارێکی دوو سەد فەرسەخی نزیکترین وێستگەی قیتاردا جێی دەبێتەوە کە بەرێوەبەرو ئەندامانی ئەنجوومەنی شار، لەو نەزانو کۆڵکە خوێنەوارانە بن کە دکتۆران بە کەشیشان دەزانن و باوەڕیان وایە دەبێ کوێرانەو بێ چەندو چوون بە گوێیان بکریو پەیرەوی دەستوورو ڕێنماییەکانیان بکرێت، ئیدی خوای دەکرد قوڕقوشمی تواوەیان بە گەرووی خەڵکیدا دەکرد. ئەگەر ئەم نەخۆشخانەیە، کە خۆی لە خۆیدا باستیلێکی بچووکە، لە هەر شارو شوێنێکی دیکە بوایە، تا ئێستا دەمێ بوو لەلایەن جەماوەری خەڵکییەوە بە کۆمەکی رۆژنامان تەختی زەوی کرابوو.

ئەوسا ئاندرێ یێفیمیچ، چاوەکانی دەکردنەوەو لە خۆی دەپرسی: "بەڵام چارە چییە؟ بەچی دەچیێ؟ چ سوودێکمان لە هەر هەموو ئەمانە بینی؟ موعەقیمات و دەرمان و کوخ و پاستوریش هیچ گۆڕانکارییەکی جەوهەریان نەکردووە، ڕێژەی نەخۆشیو مەرگیان کەم نەکردووەتەوە. ڕاستە ئاهەنگی شانۆییو کەرنەڤاڵی بالیەو ڕەقسان بۆ شێتان سازدەکرێ، بەڵام ئازادیان ناکەن بە کەیفی دڵی خۆیان بکەن، بە گوێرەی حەزو ویستی خۆیان ڕەفتار بکەن، کەواتە هەر هەموو ئەمە بێفایدەو بێبایەخەو، هیچ جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان خەستەخانەکەی منو باشترین خەستەخانەی شاری ڤێنادا نییە."

بەڵام پەڵە خەمێکی سەیرو هەستێکی بەغیلی ئاسا، کردیانە کارێك کە ئاندرێ یفیمیچ نەتوانێ بە یەکجارەکی دستبەرداری ئەم بیرو هزرە تاریك و ڕەشانە ببێت، پێدەچوو ئەمە زادەی ماندوویەتی ئەعساب بێت. سەری قورسی بەسەر کتێبەکەدا دادەهاتەوە، دەستەکانی دەنانە ژێر چەنەی تا کەمتر هەست بە قورسایی سەری بکات، دووبارە لە فکران ڕادەچوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئەم خزمەتەی من کارێکی پڕ زیانە، من مووچەی خۆم لە خەڵکانێك وەردەگرم کە فریویان دەدەم، من پیاوێکی شەریف نیم، بەڵام من بە تەنیا هیچم لە دەست نایەت و ناکەمە هیچ، من تەنیا گەردیلەیەکم لەو شەڕو گەندەڵییە کۆمەڵایەتییەی کە لەبن نایەت. تەنیا یەك گەردیلەی گەندەڵی کۆمەڵایەتی بەهۆی منەوە دروست دەبێت، چونکە هەر هەموو کارمەندانی ناوچەکەو شارەکان، خەڵکانی بەزیانو بەبێ ئەوەی هیچ خێرێکیان هەبێ، هیچ کارێك بکەن، بە خوت و خۆڕایی، لە بەلاش مووچەو مانگانە وەردەگرن... کەواتە گوناحی ئەم گەندەڵیو ماڵ وێرانییە لە ئەستۆی من نییە، بەڵکو لە ملی سەردەمو رۆژگارە... خۆ ئەگەر دوو سەد ساڵێك دواتر لە دایك بوومایە، بێگومان ئەم کەسەی ئێستا نەدەبووم، بەڵکو کەسێکی دی دەبووم."

لە سەعات سێ ی بەرەبەیاندا، بە دەم زەنگی سەعاتەکەوە، ئاندرێ یفیمیچ چراکەی خامۆش دەکردو،دەچووە ژووری نوستن، بەڵام خەو نەدەچووە چاوی .

((٨))

نزیکەی دوو ساڵێك لەوەپێش، دەستڕۆودەوڵەمەندانی ئەنجوومەنی هەرێم، ڕەحمیان تلیسایەوەو بڕیاریان دا تا کاتی دروستکردنو کردنەوەی نەخۆشخانەی دەوڵەتی، ساڵانە سێ

سەد رۆبڵ بۆ ئاوەدانکردنەوەوگەورەکردنی نەخۆشخانەکەو کۆمەکی کارگوزارانی نەخۆشخانەکە تەرخان بکەن. ئەوە بوو، هەر لە پارەی ئەو کۆمەکە، دکتۆرێکی ناوچەکەیان، بە نێوی یفگینی فیدورڤیچ خروبوتوف، بۆ شار هێنا تا یارمەتی ئاندریێ یفیمیچ بدات. یفگینی فیدورڤیچ گەنج بوو، سی ساڵی پڕ نەکردبووەوە، باڵا بەرزێکی گەنمڕەنگی مووزەرد بوو، دەموچاو پانێکی چاو چکۆلە بوو. لەوە دەچوو ئەسڵ و فەسڵی فەڕەنگی بن. بە تاقە جانتایەکەوە خۆی بە شارا کرد، تاقە کۆپیکێکی لە بەرکدا نەبوو. ژنێکی گەنجی ناشیرینی دەگەڵدا بوو و دەیگوت گوایە کارەکەرو چێشتچیەتی، ئەم ژنە منداڵێکی شیرەخۆرەی بەر مەمکەی بە باوەشەوە بوو. یفگینی فیدورڤیچ کڵاوێکی قووچی لەسەر دەناو جووتێ پووتی ملدرێژی لە پێ دەکرد. زستانان بە پۆستینێکی تیسکنەوە دەسوڕایەوە. زۆری پێ نەچوو، دۆستایەتیەکی گەرمی دەگەڵ سێرگی سیرگیوفیچی یاریدەدەری دکتۆرو، سەندوقداری خەستەخانەکەدا پەیدا کرد، بەڵام خۆی لە باقی کارمەندەکان، کە مەگەر هەر خۆی بزانێ بۆچی بە ئەشراف و ئەرستۆکراتی ناو دەبردن، دوور دەگرت. تەنیا یەك کتێب لە ماڵەکەیدا هەبوو، بە ناونیشانی "دوا ڕەچەتەو ڕێنوێنییەکانی خەستەخانەی ڤێنا، چاپی ساڵی ١٨٨١". بەبێ ئەم کتێبە نەدەچووە معایەنەی هیچ نەخۆشێك. زۆرجار شەوان لە یانەدا یاری بلیاردی دەکرد. حەزی لە وەرەقبازی و قومار نەبوو. هەمیشە ئەم جۆرە قسانەی بەسەر بەزارەوە بوو "هەر ئێستا. مرۆڤ بۆ ئەوە دروست بووە، بۆ خۆی ڕابوێرێ، کەیف بکات!" و ... هتد.

هەفتەی دووجار بۆ نەخۆشخانە دەچوو، ماوەیەك بە ژوورو قاوشەکاندا دەسوڕایەوەو معایەنەی نەخۆشانی دەکرد. نەبوونی موعەقیمات و دەرمانی پاقژکردنەوەو زۆری باکێش لە خەستەخانەکەدا پەست و بێزاری دەکرد، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبا ئاندریێ یفیمیچ زویر بێت، هەوڵی نەدەدا ڕێبازێکی تازە لە خەستەخانەکەدا دابێنێ و بگرێتەبەر. ئاندریێ ییفیمیچی هاوکارو هاوپیشەی خۆی بە ساختەچی و دزێکی پیرو دەوڵەمەند دەزانی، لە دڵی خۆیدا بەغیلی پێدەبردو حەزی دەکرد جێگای ئەو بگرێتەوە.

((٩))

شەوێکی بەهار بوو، ئاخرو ئۆخری مانگی مایس بوو، بەفرو شوێنەواری بەفر بە زەوییەوە نەما بوو، ڕەشۆڵەو تەیروتو، لە باخەکەدا دەیان خوێند، دکتۆر لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەرێ تا میخاییل ئاڤریانیچی برادەری تا بەر دەرگای حەوشە بەڕێ بکات. لەم کاتەدا موسیکای جوولەکە، کە لە دەرۆزە دەگەڕایەوە، خۆی بە حەوشەدا کرد. موسیکا کڵاوی لەسەر نەبوو، جووتێ سۆلی لاسیکی شڕی لە پێدا بوو، کیسەیەکی چکۆلەی پێ بوو کە پڕ بوو لەو خێرو سەدەقانەی کە سواڵی کردبوو.

موسیکا، لە کاتێکا لە سەرما هەڵدەرزی، بەدەم بزەیەکەوە بە دکتۆری گوت:

– لە ڕای خوا کوپیکێکم بدەیە!

ئاندرێ یفیمیچ کە هەرگیز نەیدەتوانی دەست بە ڕووی کەسەوە بنێت و داوای کەس ڕەت بکاتەوە، سکەیەکی نیو ڕۆبڵی دایە. ئەوسا نیگایەکی پێیە رووتو قڵیشاوەکانی کردو لە دڵی خۆیدا گوتی: "چەند داماوە! بەم سەرمایە پێی دەتەزێ."

ئاندرێ یفیمیچ کە هەم بەزەیی پێیدا دەهاتەوەو هەم قێزو بێزی لێدەکردەوە، بەرەو قاوشەکە دووی کابرای جولەکە کەوت، جارێ تەمەشای سەرە تاسەکەیو جارێ تەمەشای پێیە ڕووتو قڵیشاوەکانی دەکرد. هەرکە دکتۆر وەژوور کەوت، نیکتیا بە پەلە لەسەر کۆمەڵە شڕۆشیتاڵەکان هەستاو جووتە پێ لە بەردەمیا وەستا.

ئاندرێ ییفیمیچ، بە دەنگە ئارامو نەرمەکەی گوتی:

– شەو باش نیکیتا! چۆنە جووتێ پێڵاو بەم جولەکەیە بدەی؟ لەوەیە سەرمای ببێت.

– ئەمرەکەی ئەزبەنی. هەر ئێستا بە سەرپەرشتیارەکە دەڵێم.

– بێزەحمەت بە ناوی منەوە پێی بڵێ. بڵێ من داوام کردووە کە پێڵاو بەم جولەکەیە بدەن.

دەرگای نێوان ڕاڕەوەکەو قاوشی ژمارە شەش کرا بووەوە. ئیڤان دمتریچ، لەسەر جێگاکەی خۆی راکشا بوو وخێرا خۆی خستە سەر ئانیشکەکانیو گوێی هەڵخست تابزانێ ئەم دەنگە غەریبە، دەنگی کێیە، لە ناکاو دکتۆری ناسییەوە، لە کاتێکا ئازای بەدەنی لە تووڕەییدا دەلەرزی. خۆی لە تەختە خەوەکەی هەڵدایە خوارەوە، بە دەموچاوی سوور هەڵگەڕاوی پڕ ڕقو کینەو، بە چاوانی ئەبڵەقو دەرپۆقیوەوە، تا ناوەندی قاوشەکە ڕای کردو، لەوێندەرەوە هاواری کرد:

– دکتۆر هات!

ئەوسا لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

– کوڕینە پیرۆزباییتان لێدەکەم، ئاخری دکتۆر هات! وادیارە دکتۆر بە بەشەرمان دەزانێ، بە شایستەی ئەوەمان دەزانێ سەرمان بدات!

بەڵام لە ناکاو بەوپەڕی تووڕەییو هەڵچوون و ڕەفتارو ئەتواری سەیرەوە هاواری کرد:

– ماری نەعلەتی!

ئەوجا لاقی بە عاردیدا داو گوتی:

– ئەم مارە نەعلەتییە بکوژن! نا، کوشتن بۆ ئەو کەمە، شەرەفە! بیخەنە بیری ئاودەسەکەوە.

ئاندرێ یفیمیچ کە گوێی لەم قسەیە بوو، لە ڕاڕەکەوە سەری کێشایە ژوورەوەو بە هێمنی پرسی:

– بۆچی؟

ئیڤان دمتریچ، بە سیمای هەڕەشە ئامێزەوە بەرەو دکتۆر چوو، لە کاتێکا کە ئازای بەدەنی لە نێو بالاپۆشە درێژەکەیدا دەلەرزی، هاواری کرد:

– بۆچی؟

هەنگێ لێوەکانی هێنانەیەوە یەک، وەك بڵێی بیەوێ تف بکاتو، بە نەفرەتەوە گوتی:

– هەی دز! هێشتا تۆ دەپرسیت بۆچی؟ هەی جەلاد! شەلاتی!سێ بەندی!

ئاندریێ ییفیمیچ، بە دەم بزەیەکەوە وەکو ئەوەی خەتابار بێتو بیەوێ داوای بوردن بکات، گوتی:

– تورە مەبە، ئارام بە! دڵنیات دەکەم کە لە ژیانما دزیم نەکردووە، هیچ شتێکم نەدزیوە. پێموایە تۆ زیادەڕۆیی دەکەی. وادیارە زۆر لە من پڕیت، زۆر ڕقت لێمە. تکایە ئەگەر دەتوانی کەمێك خۆت هێور بکەوەو بە ئارامی پێم بڵێ بزانم بۆچی ئەوەندە تورەیت؟!.

گوتی:

– تۆ بۆچی منت لێرە داناوە ؟

– چونکە نەخۆشیت.

– بەڵێ! نەخۆش! باشە دەزانی دەیان، بگرە سەدان شێتو دێوانە، بە کەیفی خۆیان، ئازادانە دەسوڕێنەوە؟ تەنیا لەبەر ئەوەی کە تۆ لەوە نەزان تری بتوانی لە خەڵکی ئاسایی و ساغ جیایان بکەیتەوە. ئیدی بۆچی دەبێ لە نێو ئەو هەموو شێتانەدا، تەنیا منو ئەم قەرەبەختانە ناچار لەم زندانەدا بین؟ جا تۆو یاریدەدەرەکەتو سەرپەرشتیارەکەو هەر هەموو ئەم گەجەرو گوجەرو شەقاوانەی کە لە نەخۆشخانەکەی تۆدا کار دەکەن، لە ڕووی پێوەری ئەخلاقی و خوڵقییەوە زۆر لە ئێمە کەمترن، ئیدی بۆچی دەبێ ئێمە لێرە زندانی بینو ئێوە بە ئازادی بگەڕێن؟ ئاخر ئەمە چ لۆژیکێکە ؟

– ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە پێوەری ئەخلاقی و لۆژیکییەوە نییە. هەموو شتێك بەندە بە شانسو ڕێکەوتەوە. کەسێك کە بە ڕێکەوت بکەوێتە زندانەوە، دەبێ زندانی بێت. کەسێکیش کە نەکەوێتە زندان، دەتوانێ بە ئازادی بسووڕێتەوەو تەواو. دکتۆریی منو شێتاتی تۆ، پەیوەندییان نە بە ئەخلاقەوە هەیەو نە بە لۆژیكو، بەڵکو تەنیا زادەی شانسو ڕێکەوتو بویەرە کۆمەڵایەتییەکانە.

ئیڤان دمتریچ، لە قەراخ تەختەخەوەکەی دانیشتو بە دەنگێکی نوساو گوتی:

– من سەر لەم قسە هەلەقو مەلەقانەی تۆ دەرناکەم.

موسیکای جولەکە، کە ئەمشەو نیکیتا لەبەر دکتۆر رووی نەهاتبوو، گیرفانەکانی و تورەکەکەی بە تاڵ بکاتەوە، بە دەم دەرهێنانو ریزکردنی نانو خواردنی سواڵی و ورتکە کاغەزو ئێسقانو ناوکە بادەمو هەڵوژەوە لەسەر قەرەوێڵەکەی، لە حاڵێکا کە هێشتا لە سەرما هەڵدەرزی بە پەلەو لە بن لێوانەوە بە زمانی عیبری سۆزەی دەکرد، وادیار بوو لە دڵی خۆیدا وای تەسەور دەکرد کە موغازەیەکی کردووەتەوەو خەریکی کارو کاسبیە.

ئیڤان دمتریچ، بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:

– ئازادم بکە! لێمگەڕێ با بڕۆم!

– ناتوانم.

– بۆچی؟ لەبەرچی ناتوانی؟

– چونکە لە دەسەڵاتو توانای مندا نییە. تۆ خۆت بڵێ ڕەهاکردنی تۆ سوودی چییە؟ گریمان من ڕێم دایت لێرە بڕۆیت، یەکسەر خەڵکی شار یان پۆلیس دەتگرنو دووبارە بۆ ئێرەت دێننەوە.

ئیڤان دمتریچ، بەدەم هەڵگلۆفتنی نێو چەوانییەوە گوتی:

– بەڵێ! بەڵێ! هەق بە تۆیە... بەڕاستی کارەساتە! ئەدی من چبکەم؟. ها؟

دەنگی ئیڤان دمتریچ و سیمای گەنجانەو هۆشمەندی، وێڕای گرژ بوون و خاو بوونەوەی، کاریان لە ئاندرێ یفیمیچ کرد، زۆری حەز لێبوو کە دڵخۆشی ئەم گەنجە بداتەوەو هێوری بکاتەوە، بۆیە لە قەراخ تەختەکەی و لە تەنیشتیەوە دانیشت و دوای بیرکردنەوەیەکی کەم گوتی:

– دەپرسیت چی بکەی؟ بۆ تۆ باشترین کار ئەوەیە لێرە هەڵێی. بەڵام مخابن ئەم کارەش سوودی نییە. چونکە دەتگرن. کاتێ کە کۆمەڵگە لێبڕا خۆی لە تاوانباران و نەخۆشانی دەروونی و ئەقڵی، بەشێوەیەکی گشتی لە خەڵکانی ناباب بپارێزێ و جیا بکاتەوە، ئیدی کەس باری نابات، نە نەرم دەبێت و نە لەشکان دێت! جا تۆ یەك چارەت هەیە، ئەویش ئەوەیە خۆت لەگەڵ ئەم بیرەدا ڕابێنی کە گلدانەوەو ڕاگرتنی تۆ لەم شوێنەدا پێویست و مەسڵەحەتە.

– ئاخر مانەوەی من لێرەدا پێویست نییە.

– کە زیندان و شێتخانانیان دروست کرد، دەبێ خەڵکانێکیانیشی تێ بخەن. ئیدی ئەو خەڵکە یان تۆ، یان من یان خەڵکێکی دی دەبن. تۆ چاوەڕوان بکە، کەمێك سەبرو حەوسەڵەت هەبێ، تا لە ئایندەدا هیچ زیندان و شێتخانەیەك نامێنێ. هەنگێ نە پەنجەران شیشبەند دەکەن و نە دیزداشەی شۆڕ لەبەر تۆ دەکەن. بێگومان، درەنگ یا زوو ئەو سەردەمو ڕۆژگارە هەردێت.

ئیڤان دمتریچ، بەدەم بزەیەکی تەوسامێزەوە بە ئاستەمێك گرژییەوەوگوتی:

– گاڵتە دەکەیت. خەڵکانی وەکو تۆو نیکیتای هاودەست و یارمەتیدەرتان، هیچ کارێکتان بە کاری ئایندەوە نییە. بەڵام جەناب، دڵنیابە کە دەوران و ڕۆژگارێکی باشتر بەڕێوەیە! گریمان من وڕینە دەکەم،دەبزرکێنم، دەتوانیت بە قسەکانم پێبکەنی، بە قسەی پوچ و بێ مانایان بزانیت، بەڵام سپێدەی ژیانێکی نوێ لە ئەنگوتندایەو حەقیقەت و عەدالەت سەردەکەوێ و وەکو دەڵێن شایی و هەڵپەڕکێ لە گەڕەك و کۆڵانی مەش بەرپادەبێت، خەڵکی شارەکەی ئێمەش ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێڕن! دەزانم کە من ئەو ڕۆژە نابینم، تا ئەو ڕۆژە دەتۆپم، بەڵام نەوەی خەڵکانێك دەمێنن و ئەو ڕۆژە دەبینن، بەشداری ئەو ژیانە پڕخۆشی و شادییە دەکەن، لە کانگای دڵمەوە سڵاویان بۆ دەنێرم، هاوبەشی خۆشی و شادیان دەکەم، شادم بە شادییان! هاوڕێیان هەڕنە پێش، خوا یارو یاوەرتان بێت!

هەنگێ چاوەکانی پرشنگیان دا، لەجێی خۆی ڕابوو، دەستەکانی بەرەو پەنجەرەکە ڕاکێشان و بە دەنگێکی هەیەجان ئامێزەوە لەسەری ڕۆیی.

– لە پشت شیشبەندی ئەم پەنجەرەیەوە دوعای خێرتان بۆ دەکەم، پایەدار بێ حەق و عەدالەت، بژی ئازادی! خودایا چەند شادمان و خۆشحاڵم!

ئاندرێ ییفیمیچ، کە ئەداو ئەتوارە پڕجۆش و مەیلەو شانۆییەکەی ئیڤان دمتریچ، سەرنجی ڕاکێشا بوو و بەلایەوە جوان بوو، هەڵیدایەو گوتی:

– من بەش بە حاڵی خۆم هیچ هۆیەك بۆ شادمانی نابینم. دروستە کە زیندان و شێتخانان نامێنن و خۆت گوتەنی هەق و عەدالەت سەردەکەوێ، بەڵام جەوهەرو ماهیەتی مادەو شتان ناگۆڕێت و

یاساکانی تەبیعەتو سروشت بە هەمان دەقی خۆیانەوە دەمێننو وەکو هەمیشە بە نەگۆڕیی دەمێننەوە. خەڵکی لە ئایندەشدا، وەکو ئەمڕۆ نەخۆش دەکەون، پیرو فەرتوت دەبنو سەرەنجام دەمرن. گریمان سپێدەیەکی بەشکۆش ژیانی ڕوناك کردنەوە، کردی بە چراخانێکی بێ وێنە، لە ئەنجامدا هەر بەوە کۆتایی دێتو دەبڕێتەوە کە جەنازەکەت لە تابوتێك دەنەنو بۆ ناو چاڵی گۆڕی شۆڕ دەکەنەوە.

– کەواتە بەم حیسابە زندوو بوونەوەو ژیانی ئەبەدی نییە ؟

– ئاه، بەسە! بیبڕەوە!

– تۆ باوەڕت پێی نییە؟ کەیفی خۆتە، بەڵام من باوەڕم پێیەتی. یەکێك لە قارەمانەکانی نازانم دۆستویفسکییە یان ڤۆلتیرە دەڵێت ئەگەر خواش نەبوایە، بەشەر بەخۆیان خوایەکیان دادەهێنا. من بەش بە حاڵی خۆم باوەڕی تەواوم بەمە هەیە کە ئەگەر نەمریی و جاویدانیش لە حاڵی حازرشدا نەبێت، ئەوا ئەقڵی گەورەی بەشەری دەرنگ یان زوو دای دەهێنێ.

ئاندرێ ییفیمیچ، بزەیەکی شادمانی بۆ کردو گوتی:

– دەم خۆش! پێم خۆشە کە باوەڕت پێیەتی، ئەمە بۆ تۆ باشترە، کەسێك کە باوەڕی هەبێ، ئەگەر بیخەنە درزی دیواریشەوە، دەتوانێ بێ خەمو خەیاڵ بژی. بەڵام پێموایە تۆ پیاوێکی خوێنەواری، لە کوێ خوێندووتە؟

– لە زانستگەی پترزبۆرگ، بەڵام نەمتوانی تەواوی بکەم.

– تـۆ مرۆڤێکـی بـەهۆشو‌بیری. دەتـوانی دەگـەڵ هـەر ڕەوشو هەلومـەرجێکا، بـە ئـارامی و ئاسـوودەیی هەڵبەکـەی. ئەندێشـەی ئـازادو قـوڵ دەربـارەی ژیـانو تێگەییشـتن لـە مەسـەلەو نهێنییـەکانی ژیـان، لەگـەڵ دووره پـەرێزی لـە شـتە بچـووكو تورەهـاتو گـیروداره گەوجانـەکانی دنیا، دوو گەورەترین نیعمەتن کە تا ئێستا مرۆڤ پێیان گەیی بێ. جا تۆ یەکێکی لەوانەی بتخەنـە پشـت سـێ شیشـبەندی ئاسنیشـەوە، هـەر دەتـوانی ئـەم دوو بـەهرەو نیعمەتـە بەدەسـت بـێنی. دیوجین لە نێو خەمرەدا دەژیا، وێڕای ئەوەش لە گشت سوڵتانانی دنیا بەختەوەرتر بوو.

ئیڤان دمتریچ، بە ڕوویەکی گرژو پەستەوە گوتی:

– دیوجینەکەی تۆ بنیادەمێکی کەر بوو.

ئەوەی گوتو لە پڕ بە تورەیی هەستایە سەر پێیانو، لەسەری ڕۆیی:

– ئەم قسە قۆڕانە چیە کە دەربارەی دیوجینو تێگەییشتنی مەسەلەو نهێنییەکانی ژیان بۆ منی دەکەی. من حەزم لە ژیانە... ئاشقانە حەزم لە ژیانە!. من تووشی وەهمی چەوسانەوە بووم، لە من وایە بەردەوام تاقیبم دەکەن، کون بە کون بە شوێنما دەگەڕێن، هەمیشە لە ترسو دڵەڕاوکە دام، لە رەنجو عەزابدا دەژیم. بەڵام هەندێجار عەشقی ژیان سەراپام دادەگرێت، ڕێك لەم ساتانەدایە کە دەترسم شێت بم. من زۆرم حەز لە ژیانە، بێ حەد تینووی ژیانم!

ئەوسا بە دەم هەڵچوونەوە بە نێو ژوورەکە کەوتو بە ئەسپایی گوتی:

– هەر جارێ کە خەونو خەیاڵ دەمگرێت، تارمایی و تاپۆیان دەورم دەدەن، لەم جۆرە کاتانەدا خەڵکانێکی نەناس دەبینم کە لێم دێنە پێشەوە، دەنگی جیاوازو جۆراوجۆر، نەوای موزیکی

ڕوحنەواز دێنە گوێم و وام دێتە بەر خەیاڵ کە لە بێشەو جەنگەڵانی جوان و لەبەستێن‌و ڕەخێن دەریادا پیاسە دەکەم، لەم حاڵەدا پڕ بە دڵ حەزدەکەم کاربکەم، زەحمەت بکێشم‌و ڕەنج بدەم ... تۆ پێم بڵێ، خەبەرو باسی تازەی ئەوێم بۆ بگێڕەوە، خەبەری تازەی ئەوێندەر چیە.؟

– مەبەستت خەبەرو باسی شارە، یان خەبەرو باس بەگشتی؟

– با جارێ لە خەبەری شارەوە دەست پێبکەین، پاشان بێینە سەر خەبەرو باسی گشتی.

– چی بێ لە تۆ نهێنی؟ ژیان لەم شارەدا عەزابە، پیاو ماندوو ودڵتەنگ دەکات... نە کەسێکی تیایە کە بتوانی قسەی بۆ بکەیت یان گوێی لێبگریت، کەسی تازەشی بۆ نەهاتووە، تەنیا دکتۆرێکی گەنج نەبێ بە نێوی خوبوتوف.

– بەڵێ! دەزانم، کە هات من لەوێ بووم، پێت وانییە کابرایەکی زبرو بێ تەربێت بێ ؟

– ڕاستە، کابرایەکی خۆش تەربێت‌و خوێنەوار نییە. دەزانی زۆر سەیرە... بە ڕواڵەت پایتەختەکانی* ئێمە، بزوتنەوەی فیکری و ڕۆشنبیریی گەورەیان تێدایە، یانی بەم پێیە دەبوایە پڕ بوونایە لە خەڵکی واقیعبین‌و مرۆڤی تازەو مودێرن، کەچی نازانم بۆچی هەر کەڕەتێ کە سەر دێتە سەر ئەوەی کەسێك بۆ شارەکەی ئێمە بنێرێن، دەگەڕێن خراپترین‌و ناشایستەترین کەس هەڵدەبژێرن. کەسێکم بۆ دەنێرن حەزناکەم سەیری چڕوچاویشی بکەم. بەڕاستی شارێکی نەگبەت‌و بێ نازمان هەیە!

ئیڤان دمتریچ ئاهێکی هەڵکێشاو بە دەم پێکەنینەوە گوتی:

– بەڵێ، بەڕاستی شارێکی نەگبەتە! دەی هەنووکە خەبەرە گشتییەکان چیە؟ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان چ دەنووسن؟

ئیدی، دنیا تاریك بوو بوو، تاریکی باڵی بەسەر قاوشی ژمارە شەشدا کێشا بوو. دکتۆر هەستاو هەر بەسەر پێوە، باسی هەواڵ‌و گوتارێن ڕۆژنامە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکان‌و ئەو ڕێبازە فکریە تازانەی کرد کە مۆدو باویان پەیداکردبوو. ئیڤان دمتریچ بە وردی گوێی لە قسەکانی دکتۆر دەگرت‌و ناو بە ناو پرسیارێکی دەکرد. بەڵام لە ناکاودا وەکو ئەوەی شتێکی ترسناکی بیر کەوتبێتەوە، سەری نایە نێو هەردوو دەستی،و پشتی کردە دکتۆرو لەسەر تەختەکەی ڕاکشا.

ئاندرێ یفیمیچ پرسی:

– چیتە؟

ئیڤان دمتریچ، بە دەنگێکی خەمناك‌و گیراو گوتی:

– ئیدی ئامادە نیم یەك قسەت دەگەڵدا بکەم! لێمگەڕە بەحاڵی خۆمەوە.

– ئاخر بۆچی ؟ مەگەر چ بووە؟

– پێمگوتی وازم لێ بێنە! عەجەب شەیتانێکە!

دکتۆر شانەکانی هەڵتەکاند، ئاهێکی هەڵکێشاو لە قاوشەکە وەدەرکەوت. کە بەڕاڕەوەکەدا تێ دەپەڕی، رووی کردە نیکیتاو گوتی:

– چۆنە ئێرە خاوێن بکەیتەوە...! بۆنێکی ناخۆشی لێدێ!

– ئەمرەکەی ئەزبەنی، بە چاوان.

ئاندریێ ییفیمیچ. له کاتێکا بەرەو ماڵ نشێو دەبووەوە، بەدەم ڕێگاوە له دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەم ئیڤان دمتریچە چەند گەنجێکی باش‌و ماقووڵە. لەوەتای لەم شارەدا دەژیم، تووشی هەزاران کەس بووم، کەچی ئەو تاقە کەسێکە پیاو بتوانێ قسەی دەگەڵدا بکات. ئەم گەنجە توانای بیرکردنەوەو قەزاوەتی هەیە، قسەو بۆچوونەکانی لۆژیکی وماقووڵن، تەنیا بایەخ بە شتە گرینگ‌و پێویستەکان دەدات.

ئەو شەوە، چ له کاتی خوێندنەوەو موتالاداو چ ئەو کاتەی چووە ناو جێگاوە، هەر بیری لەلای ئیڤان دمتریچ بوو. بەیانیش کە لە خەو ڕابوو، جارێکی دی بیری کەوتەوە کە دوێ شەو ئاشنایەتی دەگەڵ پیاوێکی ئاقڵ‌و زیرەکدا پەیدا کردبوو، بۆیە له دڵی خۆیدا بڕیاری دا هەرکە دەرفەتی بۆ هەڵکەوت، یەکەم ئیشی ئەوە بێت، جارێکی دی بچێتە سەردانی.

***- مەبەست لە مۆسکۆ وپترسبۆرگە.***

((١٠))

ئیڤان دمتریچ، وەکو دوێنێ شەو، سەری له نێو هەردوو دەست‌و، ئەژنۆکانی بەسنگی خۆیەوە نابوون‌و بە جۆرێ لەسەر تەختەکەی پاڵکەوتبوو، کە دەموچاوی دیارنەبوو. دکتۆر خۆی بە قاوشەکەدا کردو گوتی:

– سلاو دۆستی ئازیز! خۆ نە نوستوویت؟

ئیڤان دمتریچ، هەر بەو دەقەوە کە دەموچاوی بە بالیفەکەیەوە نابوو، وەڵامی دایەوە:

– یەکەم من دۆستی تۆ نیم، دووەم تۆ بە خۆڕایی خۆت ئەزیەت دەدەی، چونکە ئامادەنیم تاقە یەك قسەشت دەگەڵدا بکەم.

ئاندریێ ییفیمیچ، بە سەرسامی‌و شپرزەیی‌و لەبن لێوانەوە گوتی:

– زۆر سەیرە!... دوێنێ هێدی‌و هێمن‌و دۆستانە پێکەوە گفتوگۆمان دەکرد، نازانم بۆچی لە پڕێکا زویر بوویت‌و گفتوگۆکەت بڕی... ناشێ قسەیەکی خراپم کردبێت، یان قسەکانم دژی بیرو بۆچوونەکانی تۆ بووبن.

ئیڤان دمتریچ، هەر لە سەر تەختەکەیەوە نیمچە ئاخیزێکی بۆ کرد، نیگای چاوە سوور هەڵگەڕاو مەخسەرە ئامێزو ئاشوفتەکانی بڕییە دکتۆرو گوتی:

– بە تەمای بەو ئاسانییە باوەڕ بە قسەکانت بکەم؟ باشتر وایە بڕۆی لە شوێنێکی دیکە جاسوسی‌و هەواڵدزی خۆت بکەی! لێرە هیچ بە هیچ ناکەیت. من دوێ شەو زانیم کە بە چ مەبەستێ بۆ ئێرە هاتبوویت.

دکتۆر بە دەم زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

– ئەمە چ وەهمێکی سەیرە! یانی تۆ من بە جاسووس دەزانی؟

– بەڵێ!... کەسێك بۆ ئەوە دانرابێ کە من تاقی بکاتەوەو قسەم لێ دەربێنێ‌و ئازاری ڕوحم بدات، چ دکتۆر بێ‌و چ جاسووس، فەرقی چییە؟

– ئاخ! بەڕاستی تۆ چ ... ببوورە... بنیادەمێکی سەیریت!

هەنگێ دکتۆر لەسەر تەپڵەکێکی کەنار تەختەخەوەکە دانیشت، سەرێکی گلەیی ئامێزی بۆ لەقاندو گوتی:

– با وای دابنەین هەق بە تۆ بێ، وای دابنە من بە قەستی خیانەت دەمەوێ قسەت لێ دەربێنمو خەبەری پۆلیست لێبدەم تا بتگرن، پێت وایە چ دەبێ؟ ئەوپەڕی دەتگرن، حوکمت دەدەنو دەتخەنە بێگارە زندانەوە. تەسەور دەکەیت وەزعت لە دادگا یان لە زنداندا لێرە خراتر دەبێت؟ خۆ ئەگەر حوکمی زندان یان بێگارە زندانیش بدرێی، هێشتا وەزعو حاڵت، لە وەزعو حاڵی ئێرە هەر خراتر نابێت. نا، تەسەور ناکەم خراتر بێت... کەواتە تۆ لە چی دەترسیت؟

دیار بوو ئەم قسانە کاریان لە ئیڤان دمتریچ کرد، چونکە هەستاو بە ئارامی لەسەر تەختە خەوەکەی دانیشت.

دەوروبەری سەعات پێنجی دوا نیوەڕۆ بوو، یانی ئەو کاتە بوو کە دکتۆر ڕۆژانە لە ژوورەکانی ماڵەکەی خۆیدا پیاسەی دەکردو داریوشکا دەهاتو لێی دەپرسی: "ئایا کاتی ئەو نەهاتووە بیرەیەك بخواتەوە؟" هێشتا زوو بوو، دنیای دەرەوە ڕوناكو ئارام، ئاسمان شینو ساف بوو. دکتۆر گوتی:

– من دوای نیوە ڕۆژە حەزم کرد پیاسەیەك بکەم، ئیدی لە ماڵ هاتمە دەرێو ویستم لەسەر ڕێگای خۆمەوە سەرێکی تۆ بدەم. بەڕاستی بەهارێکی جوانە!

ئیڤان دمتریچ پرسی:

– لە چ مانگێکداین؟ مانگی مارسە؟

– بەڵێ، ئاخرو ئۆخری مارسە.

– بێگومان حەوشەو بانەکەو کۆڵانو جادەکان هێشتا قوڕو قوڕاوە.

– زۆریش نا. باریکە ڕێگای ناو باخو باخچەکان وشك بوونەتەوە.

ئیڤان دمتریچ وەکو یەکێك تازە لە خەو ڕابووبێ، چاوە سوورەکانی هەڵگڵۆفتو گوتی:

– چەند خۆشە پیاو لەم کاتو هەوا خۆشەدا گالیسکەیەك بگرێتو گەشتێکی دەرەوەی شار بکاتو پاشان بگەڕێتەوە بۆ ژوورە گەرمو گوڕو خۆشەکەی خۆیو... ئەوجا بۆ چارەسەری ژانەسەرەکەی بچێت بۆ لای دکتۆرێکی کارامەو لێزان... زۆر دەمێکە وەکو بنیادەم نەژیاوم. بەڕاستی ئێرە شوێنێکی پیسو ناخۆشە! یانی ناخۆشیەکەی لە کێشدا نییە.

دوای ئەو هاڕوژانەی کە دوێ شەو تووشی بوو بوو، پەژمردەو ماندوو دەهاتە بەرچاو و، بەبێ مەیلی قسانی دەکرد. قامکەکانی دەلەرزینو بە سیمایدا دیاربوو کە ژانە سەرێکی قورسی گرتووە.

ئاندرێ یفیمیچ گوتی:

– هیچ جیاوازییەك لە نێوان ژووری گەرمو گوڕو خۆشو، ئەم قاوشانەدا نییە، بەشەر دەبێ لە ناخی خۆیدا بۆ ئاسوودەییو ئارامی بگەڕێت نەك لە دەرەوە.

– یانی چۆن؟

– تۆ تەمەشا، خەڵکی ئاسایی لە دەرێی خۆیدا، واتە لە شتانی وەکو گالیسکەو ژووری کارکردن‌و ئەو شتانەدا بۆ چاکی‌و خراپی دەگەڕێت، بەڵام خەڵکی فامیدەو ژیر لە ناخی خۆیاندا بۆ چاکی‌و خراپی دەگەڕێن.

– بڕۆ ئەم فەلسەفەیە لە یۆناندا، کە ئاو هەواکەی فێنك‌و خۆشەو یەکپارچە بۆن‌و بەرامەی نارنجە، بڵاوبکەوە. ئەم فەلسەفەیەی تۆ بە دەردی ئێرە ناخوات، لەگەڵ ئاوو هەوای ئێرەدا ناگونجێت. نازانم لەگەڵ کێدا بوو کە باسی دیوجینم دەکرد؟ لەگەڵ تۆدا بوو؟

– بەڵێ! دوێ شەو باسمان کرد.

– دیوجین، پێویستی بە ژووری خۆش‌و شوێنی گەرم نەبوو، چونکە ئاوو هەوای وڵاتەکەی بەجۆرێ بوو کە بەبێ ئەو شتانەش ئاسوودەو ڕەحەت بوو، لە ناو خەمرەکەی دادەنیشت‌و هەر پڕتەقاڵ‌و زەیتونی دەخوارد. بەڵام ئەگەر لە روسیادا بوایە بە جۆرێ سەرما زەیفی لێ دەسەند کە دەبوا نەك هەر لە مانگی دیسامبەردا، بەڵکو لە مانگی مایسشدا، لە خەڵکی بپاڕێتەوە کە ژوورێکی گەرم‌و گوڕی بدەنێ، بێگومان لە سەرما ڕەق دەبووەوەو ئەعسابی تێك دەچوو.

– نا، نا وانییە! سەرماش وەکو هەر دەردو ئازارێکی دی دەشێت مرۆڤ هەستی پێنەکات، فەراموٚشی بکات. مارك ئورلیوس* دەڵێت: "دەردو ئازار، وێنایەکی زندوو و بەرجەستەی خودی ئازارە، هەرکەسێك بیەوێ ئەو وێنایە بگۆڕێت، دەبێ غیرەت‌و ورە بنێتە بەرخۆی، بیری لێنەکاتەوە، دادو بێداد نەکات، خۆی بۆ شل نەکات، بێ چەندوچوون ئەو دەردو ئازارەی دەپەڕێت‌و لە کۆڵی دەبێتەوە." ئەم وتەیە زۆر دروستە. جیاوازی خەڵکی زانا یان خەڵکی هۆشن دەگەڵ خەڵکێن ئاساییدا لەمەدایە کە لە دەردو ئازار، بێباکن، بە چاوی سووك تەمەشای دەکەن، خۆی بۆ شل ناکەن، ئەوانە هەمیشە خۆشحاڵن‌و، بێ منەتن‌و سەریان لە هیچ پێشهاتێك ناسوڕمێ.

– کەواتە من چونکە ئازار دەچێژم‌و، دڵم خۆش‌و شاد نییە، سەرم لە کەمی‌و ناڕەسەنی خەڵکی سوڕ دەمێنێ، دەبێ کابرایەکی گەوج بم.

– نا، مەبەستم ئەمە نەبوو. دەردو ئازارەکەی تۆ بێهودەیە. چونکە ئەگەر کەمێك قووڵتر بیر بکەیتەوە، هەنگێ بۆت بە دیاردەکەوێ، کە هەر هەموو ئەو فاکتەرە دەرەکیانەی بەمجۆرە هێناومانیەتە وڕوژان، چەند سواوو بێ بایەخن. هەوڵی ڕاستەقینەی مرۆڤ لە پێناوی ئەوەدایە بە دروستی لە چەمك‌و مانای ژیان بگات، کە نەجاتی واقیعی مرۆڤ لەمەدایە، ئەمە خۆی لە خۆیدا گەورەترین نیعمەتە.

ئیڤان دمتریچ، بڕۆی وێکهێنایەوەو گوتی:

– چەمك... فاکتەرێن دەروونی... بێرونی... ببورە من سەر لەم قسانەی تۆ دەرناکەم.

ئەوسا هەستایە سەر پێیان، نیگایەکی پڕ توڕەی دکتۆری کردو لەسەری ڕۆیی:

– من ئەوەندە دەزانم کە خواوەند منی لە خوێنی گەرم‌و دەمارو ئەعساب دروست کردووە. جا ئەگەر تانوپۆی بەدەن، ژیانی تیابێ، زندوو بێت، دەبێ لە هەنبەر هەر کارێکدا کاردانەوەی خۆی هەبێت. منیش لە هەنبەر هەر کاریگەرییەکی دەرەکی‌و بێرونی کاردانەوەم دەبێت، لە بەرانبەر

دەردو ئازارا، ناڵەو هاوارو گریانم دەبێت، لە هەنبەر کمیو نزمی، بێزاریی، لە هەنبەر بەدئاکاریو بیٚ فەڕی و ناڕەسەنیدا قێزو بێزم هەیە. بەبۆچوونی من ئەم کاردانەوانە، ژیانە. تا ئۆرگانیزمی بەدەن نزمترو لاوازتر بێت، ئەوەندە هەستیاریی لە هەنبەر باندۆرێن بێرونی لاوازتر دەبێتو کاردانەوەی کەمتر دەبێت. بە پێچەوانەشەوە تا ئۆرگانیزمی بەدەن بەرزترو ئاڵۆزتر بێت، ئەوەندە لە هەنبەر ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆیدا، لە هەنبەر باندۆرە دەرەکییەکاندا، هەستیارترو پڕ کاردانەوەتر دەبێت. چۆن تۆ ئەمانە نازانیت؟ پیاو دکتۆر بێتو ئەم شتە سادەو ئاساییانە نەزانێت؟! ئەگەر کەسێك بیەویٚ دەردو ئازار بە هەند نەگرێتو بە چاوی سووك تەمەشای بکاتو هەمیشە بە هەر پێشهاتێك رازی و قاییل بێت دەبیٚ... لە کاتێکا بەدەست ئاماژەی بۆ ئەو دێهاتییە زەلامو قەڵەوە دەکرد کە لەسەر تەختەکەی ڕاکشا بوو، دەکرد.. لەسەری ڕۆیی:

– ...دەبیٚ یان بە مەرەدی ئەمە بچێت، یان بەڕادەیەك خوو بە دەردو ئازارەوە بگرێت کە هەستی پیٚ نەکاتو هەموو هەستیارییەکی خۆی لە دەست بدات، بە کورتیەکەی فڕی بەژیانەوە نەمێنیٚ.

ئەوسا بە توڕەییو هەڵچوونەوە لەسەری ڕۆیی:

– ببوورە، من نە زانامو نە فەیلەسوف، زانیارییەکی ئەوتۆم لەمەڕ ئەم مەسەلانە نییە،و لە وەزعو حاڵێکی ئەوتۆشدا نیم بتوانم ئەکادیمیانە بیربکەمەوەو بە بەڵگەوە گەنگەشەیان لەسەر بکەم.

– نا، بە پێچەوانەوە، تۆ زۆر بەچاکی مەسەلەکان لە بنجو بناوان دەکەیتو داوەریان لەسەر دەکەیت!

– ڕەواقیەکان، کە تۆ ڕێك لاسایی ئەوان دەکەیتەوە، خەڵکانێکی زۆر باش بوون، بەڵام فەلسەفەکەیان، لە وەتای دوو دانە هەزار ساڵە نەك هەر لەجێی خۆی وەستاوە، بەڵکو لە پاشی داوەو نەك تاقە زەڕەیەك پێش نەکەوتووە، بەڵکو لە ئایندەشدا پێش ناکەوێت، چونکە دیدو بۆچوونەکانیان نەك هەر پراکتیکی نەبووە، بەڵکو بۆ ژیانی بەشەریش پێویست و زەرووری نەبووە.. ئەم دیدو بۆچوونانە تەنیا لای کەمینەیەکی کەم، بایەخدارو پەسند بووە، کە ژیانی خۆیان وەقفی فێر بوونی زانیاریو فەلسەفەی جۆراوجۆر کردووەو لەزەتیان لیٚ بینیوە، دەنا ئەم فەلسەفەیە لەلای زۆرینەی خەڵك ناکاتە هیچو مانایەکی نییە. فەلسەفەیەك داوا لە خەڵکی بکات کە گویٚ بە ماڵو سەروەتی دنیاو خۆشگوزەرانی نەدەن، کە باکیان بە دەردو ئازارو مەرگ نەبێت، لەلای زۆربەی جەماوەری خەڵکی، هیچ ماناو چەمکێك ناگەیەنیٚ، چونکە ئەم زۆرینەیە هیچ کاتێك نە دەوڵەمەند بووە نە خۆشگوزەران. دیارە لە ڕوانگەی ئەم زۆرینەیەوە، گویٚ نەدان بە دەردو ئازار، سووك تەمەشاکردنی دەردو ئازار، هاوتای سووك تەمەشاکردنی خودی ژیانە، چونکە سەرانسەری بوونی بەشەری بریتییە لە زنجیرە هەستێکی وەکو هەستی برسێتی، سەرما، ڕەنجو ئازار،و ترس لە مردن – هەمان ئەو ترسەی کە هاملێت گرفتاری بوو بوو– بەڵیٚ! ژیانی بەشەر لەم هەستانەدا پەنهانە. بۆیە دەشێت کەسێك لە ژیان تێرو بێزار ببێت، بەڵام ناتوانیٚ ببیبێزرێنیٚ، بە سووکی تەمەشای بکات. بۆیە دووبارەی دەکەمەوە کە فەلسەفەی ڕەواقی هیچ ئایندەیەکی گەشو درەخشانی نابێت، بەڵام وەکو دەبینی، لە وەتای سەدان ساڵەوە تا ئەمڕۆ،

ململانێ، هەستیاریی لە هەنبەر دەردو ئازار، توانای کاردانەوە لە هەنبەر فاکتەرانی دەرەکی و بێرونیدا هەبووەو بەردەوام لە پێشکەوتندا بووە...

لە پڕ زنجیرەی بیرەکانی ئیڤان دمتریچ پسایەوە، هەڵوەستەیەکی کرد، بە کەسەرەوە دەستێکی بە تەوێڵی خۆیدا مالی و گوتی:

– دەمویست باسی بابەتێکی گرینگت لەگەڵدا بکەمەوە، بەڵام سەری کلافەکەم لیٚ ون بوو. ئەریٚ بەڕاست باسی چیم دەکرد؟ ئا، بیرم کەوتەوە. دەڵێن یەکێك لە ڕەواقیەکان، بۆ ئەوەی یەکێك لە خزمەکانی خۆی لە کۆیلایەتی ئازاد بکات، بە خوایشتی خۆی و بۆ هەتا هەتایە تەوقی ئەسارەت و دیلی لە گەردنی خۆی کردبوو. ملاحەزە دەکەی کە تەنانەت کەسێکی پابەندی فەلسەفەی ڕەواقیش، لە هەنبەر توڕەیی و باندۆری بێرونیدا چۆن کاردانەوەی نیشان داوە، چونکە دەبیٚ بۆ ئەنجامدانی کارێکی جوامێرانەو هیمەتێکی پیاوانەی لەو بابەتە، یانی خۆ فیداکردن لە پێناوی هاوڕەگەزێکی ئازیزی خۆتا، دەبیٚ ڕوحێکی سەرڕێژ لە هاودەردی و هاوخەمی و هاوسۆزیت تیابیٚ. من هەرچیم دەزانی و فێری بوو بووم، لەم زندانەدا لە بیرم چوونەتەوە، دەنا لەوە بوو نموونەی زندووترو بە سوودترم بۆت هێنابایەوە. بەڕاست وەرە با حەزرەتی عیسا بە نموونە بێنینەوە، تەنانەت کاردانەوەی ئەویش لە هەنبەر ڕووداوەکانی ژیانا، هەر گریان و خەندە،و خەمینی،و توڕە بوون، و تەنانەت خەفەت خواردن بووە. هەرگیز بە پێکەنین و خۆشیەوە بەرەو پیری دەردو ئازار نەچووە، مەرگی بە سووك و کەم نەزانیوە، تەنانەت بۆ ئەوەی لەم چارەنووسە خەمناکە ڕزگاری بیٚ، لە باخی جنسیماندا کەوتبووە دوعاو نزاو پاڕانەوە.

ئیڤان دمتریچ، لێرەدا کەوتە پێکەنین، دانیشت و لەسەری ڕۆیی:

– گریمان تۆ ڕاست دەکەی، ئاسوودەیی و ئۆقرەی بەشەر لە ناخی خۆیدایە، نەك لە دەرەوەی خۆی. گریمان دروست ئەوەیە گویٚ بە دەردو ئازار نەدرێت و بە سووکی بگیریٚ و تەمەشا بکرێت، ببیزێنریٚ و هیچ پێشهاتێك بە سەیر نەزانریٚ و بە هەند نەگیرێت. بەڵام تۆ بە چ هەقێك ڕیٚ بە خۆت دەدەی ئەم ڕێبازو فەلسەفەیە بڵاو بکەیتەوە؟ مەگەر تۆ هزرڤان و فەیلەسوفیت؟

– نەخێر! من فەیلەسوف نیم، بەڵام پێویستە لەسەر هەر مرۆڤێك ئەم فەلسەفەیە بڵاوبکاتەوە، چونکە دەگەڵ ئەقڵ و لۆجیکدا تێك دەکاتەوە.

– نا! من دەمەویٚ بزانم بۆچی لە مەسەلە لۆژیکی و ئەقڵیەکاندا، لە مەسەلەی بێزراندنی ئازارو دەردو ئەو شتانەدا خۆت بە پسپۆڕو شارەزا دەزانیت؟ تا ئێستا ڕەنجت کێشاوە؟ ئایا لە چەمکی دەردو ئازار تێدەگەیت؟ باشە پێمان بڵیٚ ئاخۆ بە منداڵی شەلاق کاریان کردوویت؟ بەر شەلاقیان داویت؟

– نەخێر، باوك و دایکم باوەڕیان بە هیچ سزایەکی بەدەنی نەبوو.

– بەڵام بابی من زۆر بیٚ ڕەحمانە بەر شەلاقی دەدام، بابم کارمەندێکی زبرو توندە تەبیعەت بوو، کەپوویەکی درێژو ملێکی زەردی هەبوو، مایەسیرییەکی قورسی لەگەڵدا بوو، بەڵام با واز لەو بێنین و بێینە سەر باسی تۆ. بە عەمراتت کەسێك پەلەپیتکەیەکی لیٚ نەداوی، کەس چاوی لیٚ

سـوور نەكردوويتـەوە، كـەس هەڕەشـەی لێنـەكردويت، كـەس نـەی چەوسـاندوتيەوە، تۆكمـەو سـەلامەت و قەڵـەو دەڵێـی گامێشـی. لـە ژێـر پـەڕو بـاڵی باوكتـا گـەورە بوويـت، بـە پـارەی ئـەو خوێندنت تەواو كردووەو ئەوسا يەكسەرو بە واسيتەكاری كارێكی پڕ دەرامەت و كەم زەحمەتيان بەبێ ئەوەی موستەهەق بی، داويتێ. پتر لە بيست ساڵە لـە خانوويـەكی گـەرم و گوڕو روناكدا، دەژی كە نە لە ئاوی كەمەو نە لە كارەبا، تاقە پولێك كرێ نادەی. كارەكەری خۆڕاييت هەيـە، سەربارى ئەوەش هـەم دەسـەڵاتت هەيـەو هـەم هـەق، كـە بـە كـەيفی دڵـی خـۆت دەوام بكـەيت يـان نەكەيت... بۆيە تۆ پياوێكی تەمەڵ و تەوەزەليت، بە جۆرێ ژيـانی خـۆت رێـك خستووە، كـە هـيچ شـتێك نـەتوانێ نارەحـەتت بكـات، يـان بتهـاڕوژێنێ، هـەموو كارەكـانی خـۆت داوە بەسـەر ياريدەدەرەكـەت و گەجـەرو گوجـەرو لات و لـەوێرەكانی تـری نەخۆشـخانەكەداو بـە خـۆت لـە ژوورێكی گەرم و گوڕو گەورەدا پاڵت لێداوەتەوەو پارە دەخەيتـە سـەر يـەك، كتێـب دەخوێنيتـەوە، بير لە شتی تورەهات و گەوجانە دەكەيتەوە...

نيگايەكی كەپووە سوورەكەی دكتۆری كردو لەسەری رۆيی:

..بە كامی دڵ بيرە دەخۆيتەوە. بە كورتيەكەی تۆ لە ژياندا هيچت نەديتوەو، هيچت دەربارەی ژيان نەزانيوەو نەجەڕباندووە، تەنيا زانيارييەكی تێوری سەرڤە سەرڤەی رووتت دەربارەی دنيای واقيع هەيە. بۆيەش خەمساردو بێ موبالات، چ بە ڕاست و چ بە درۆ دەردو ئازار دەبوغزێنی، بە سووك تەمەشای دەكەيت، چونكە نەخۆشی و مردن، لۆژيك و ئەقڵ، شادمانی ڕاستەقينەو ئەم فەلسەفە رێسييە بە زيانانە، لەبارترين فەلسەفەن بۆ پياوی تەمەڵ و ئيش نەكەر. بۆ نموونە تۆ ئەگەر جووتيارێك ببينی لە ژنەكەی دەدات. لە دڵی خۆتا دەڵێی: "بۆچی داكۆكی لەم ژنە بكەم؟ با لێی بدات! هيچ گرينگ نييە، چونكە درەنگ يان زوو هەردووكيان دەمرن، لەم حاڵەتەدا كابرا خۆی ئازار دەدات نەك ژنەكەی، واتە كارەكەی سووكييە بۆ خۆی نەك بۆ ژنەكەی." تۆ پێت وايە مەيخۆری و بەدمەستی كارێكی زۆر گەوجانەو ناشيرينە، بەڵام پياو چ بخواتەوەو چ نەخواتەوە لە ئەنجامدا هەر دەمرێت. نموونەيەكی دی، ئەگەر پيرەژنێك تووشی ددان يەشە بووبێت، بۆ چارەسەرو دەرمان بێتە لای تۆ... پێی دەڵێی: "مەگەر چ قەوماوە؟ ئازار و نەخۆشی دەكاتە تەسەوری خودی ئازار و، نەخۆشی دەكاتە سێبەرو نمای ئازار. خۆ لەم دنيايەشدا سەر بێ سەريەشە نابێ، كەس بەبێ ئازار نابێت و هەمووشمان هەر گيای مردنين. دەيسا بڕۆ پيرەژن، هەيدێ لەبەر چاوم گوم بە، وازم لێبێنە با بۆ خۆم بيربكەمەوەو ڤۆدكا بخۆمەوە." يان ئەگەر گەنجێكی بێ ئەزموون بێت و ڕاوێژت پێبكات كە لەم دنيايەدا چ بكات و چۆن بژی؟ تۆ يەكسەرو بێ هيچ ڕامانێك پێی دەڵێی: "بڕۆ لە ڕای دەركی مەعنەويات يان خۆت گوتەنی سەعادەتی ڕاستەقينەدا تێ بكۆشە!" بەڵام ئەم سەعادەتە واقيعی و ئەفسانەييە چييە؟ بەخۆتيش نايزانيت. بۆ نموونە ئێمە لێرەدا، لە پشت ئەم شيشبەندانەوە حيجز دەكەن، ئەشكەنجەو ئازارمان دەدەن، لێرەدا دامان دەڕزێنن، بەڵام ئەم كارە لە ڕوانگەی تۆوە كارێكی تەواو ئاقڵانەو لۆژيكيە، چونكە بەتەسەوری تۆ هيچ جياوازييەك لە نێوان ئەم قاوشە پيس و پۆخڵەو ئۆفيسێكی گەرم و گوڕو پاك و خاوێن وڕەحەتدا نييە. بەڕاستی فەلسەفەيەكی لەبارو بێ خەوشە! بە شەرت فەلسەفەيە! تۆ

بە پشتیوانی ئەم فەلسەفەیە بە تیریٚ چەند نیشان دەشکێنیٚ: هەم هیچ کارێك ناکەیت، هەم ویژدانت پاكو ئاسوودەیەو، هەم خۆت بەهزرڤان دەزانێت... نا! برادەری ئازیز نا، خەیاڵت خاوە، ئەم کارە فەلسەفەو هزرو بۆچوونی ناوازەو دەوڵەمەند نییە ، بەڵکو تەمەڵیو گۆشەگیریو قەدەریەتو سست ئەقڵییە...

ئیڤان دمتریچ، هەڵوەستەیەکی کرد، بە نەفەسێکی توڕەترەوە لەسەری رۆیی:

– بەڵیٚ، تۆ گویٚ بەدەردو ئازار نادەیت، بە گرینگی نازانیت، بەڵام ئەگەر پەنجە توتەت بە دەرگاکەوە بێت، تاهێز لە گەرووتایە هاوار دەکەیت.

ئاندریٚ ییفیمیچ، نەرمە بزەیەکی بۆ کردو گوتی:

– لەوەشە هاوار نەکەم!

– مەحاڵە هاوار نەکەیت، بە دەنگی بەرزیش هاوار دەکەیت! یان ئەگەر خۆت ئیفلیجو زەوینگیر ببیت یان گریمان کەسێکی خۆسەری گۆساخ، بە پشتیوانی پلەو پایەی بەرزی خۆی، بەبەرچاوی خەڵکییەوە سووکایەتیت پێبکاتو سوور بزانیت لەسەر ئەم کارەی سزا نادرێت، هەنگیٚ تێدەگەی کە ئامۆژگاری کردنی خەڵکی بۆ "دەرکی مەعنەویاتو سەعادەتی ڕاستەقینە" چ تامێکی هەیە!

ئاندریٚ یفیمیچ کە قسەکانی ئەوی لە گیان خۆش بوو و، لە خۆشیاندا پێدەکەنیو دەستەکانی لێکدی دەخست، گوتی:

– قسەکانت جوانو تازەن! بەڕاستی بۆچوونەکانت خۆشحاڵم دەکەن. ئەو وەسفەی کە ئێستا دەرهەق بەمن کردت، بەڕاستی جوان بوو، ئەلهەقی قسە کردن دەگەڵ تۆدا یەجگار خۆشە. من تائێرە گوێم لە تۆ گرت، جا ئێستا نۆرەی تۆیە کە لوتف بفەرموویتو گویٚ لە قسەکانی من بگریت....

**– ئۆرلیۆس: ئیمپرتۆری ڕوم (١٨٠–١٢١ز)*

((١١))

ئەم گفتوگۆیە نزیکەی یەك سەعاتی دی بەردەوام بوو، ئەم گفتوگۆیە کارێکی قووڵی لە ئاندریٚ یفیمیچ کرد. بۆیە لەو رۆژە بە دواوە هەموو رۆژیٚ بەیانیانو دوا نیوەڕۆیان دەچوو بۆ قاوشی ژمارە شەشو زۆرجار تا ئێوارەیەکی درەنگ گفتوگۆی دەگەڵ ئیڤان دمتریچدا دەکرد. ئیڤان دمتریچ لە سەرەتاوە سڵی لە دکتۆر دەکردەوە، لە نیازپاکی وی بە گومان بوو، و بە ئاشکرا بێزاریو نەیاری خۆی دەردەبڕی، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم لەگەڵیا ڕاهات ئەو رەفتارە توندو زبرەی جارانی نەما، شێوازێکی بەتەوسی مدارا ئامێزی گرتەبەر.

ئیدی خێرا لە سەرانسەری نەخۆشخانەکەدا بڵاوبووەوە کە ئاندریٚ یفیمیچ، ڕۆژانە سەری قاوشی ژمارە شەش دەدات. هیچ کەس – نە یاریدەدەری دکتۆر، نە نیکیتاو نە پەرستارەکان– سەریان لەوە دەرنەدەکرد کە بۆچی دکتۆر بۆ قاوشی ژمارە شەش دەڕۆیی، بۆچی بە سەعاتان لەوێندەر دادەنیشتو باسی چی دەکرد؟ ئەگەر بەمەبەستی معایەنەی نەخۆشەکان دەڕۆیی،

بۆچی ڕەچەتەی دەرمانی بۆ پڕ نەدەکردنەوە. خولاسە ڕەفتاری دکتۆر گۆڕابوو و سەیرو سەمەرە دەهاتە بەرچاو. ڕێك بە پێچەوانەوەی جارانەوە، میخاییل ئاڤریانیچ، زۆربەی کات دکتۆری لە ماڵەکەی خۆیدا نەدەبینی، داریوشکا، زۆر نیگەران و پەریشان بوو، چونکە دکتۆر وەکو جاران لە کاتی خۆیدا بیرەکەی نەدەخواردەوە، تەنانەت هەندێجار بۆ نیوەڕۆژەو فراڤینیش لە جاران درەنگتر بۆ ماڵ دەگەڕایەوە.

ڕۆژێك، کە دەوروبەری ئاخروئۆخری مانگی تەمووز بوو، دکتۆر خوبوتوف، بە کارێك چوو بۆ دیدەنی ئاندریێ یفیمیچ، چونکە لە ماڵەوە نەبوو، ئیدی بۆ تاقیبی وی بە ناو حەساری بینایەکە کەوت، لەوێندەر پێیان گوت کە دکتۆری پیر چووەتە معایەنەی نەخۆشە دەروونیەکان. کاتێ کە خوبوتوف گەییە ڕاڕەو و دالانەکە، گوێی لە ئیڤان دمتریچ بوو کە بە دەنگێکی نیمچە توڕە دەیگوت:

– من و تۆ هەرگیز ڕێك ناکەوین، مەحاڵە بتوانی بمهێنیتە سەر بیروباوەڕی خۆت. تۆ فرت بە واقیعەوە نییەو هیچ لە واقیع نازانی، لە ژیانتا ئازارو ناخۆشیت نەچەشتووە، تەنیا وەکو زەروو خوێنی خەڵکیت مژیوە. بەڵام من لەوەتای چاوم بە دنیادا هەڵیناوە تاکو ئەمڕۆ، هەمیشە لە مەینەتی و ئازارو ئەشکەنجەدا بووم، بۆ ساتێ لە دەست ئازار ڕەها نەبووم، بۆیە ڕێك و ڕەوان دەیڵێم کە خۆم لە تۆ بە زیاتر دەزانم، لە هەموو ڕوویەکەوە خۆم لە تۆ بە شارەزاترو کارامەتر دەزانم. بۆیە تۆ ئەوە نیت من ئامۆژگاری بکەیت.

ئاندریێ یفیمیچ، کە تەسەوری دەکرد، ئیڤان دمتریچ، نایەوێ لە مەبەستی ئەو حاڵی ببێت، بە ئەسپایی و بە دەنگێکی خەم ئامێزەوە گوتی:

– نا، من بە هیچ جۆرێ مەبەستم ئەوە نییە کە بیروبۆچوونی خۆمت بەسەردا بسەپێنم. برادەری ئازیز! مەسەلەکە ئەوە نییە کە تۆ ڕەنجت کێشاوەو من ڕەنجم نەکێشاوە، ڕەنج و شادی دوو حاڵەتی ڕەوتەنین، جێگیرو پایەدارنین، پێویست ناکا باسیان بکەین. گرینگ ئەمەیە من و تۆ توانای بیرکردنەوەمان هەیە، من و تۆ لە جوملەی ئەو خەڵکانەین کە دەتوانن بیربکەنەوە، دیاردەو ڕووداوەکان تاوتوێ بکەن و داوەری بکەن. جا ئەمە خۆی لەخۆیدا، چەند لە بیرکردنەوەشا لێکدی جیاواز بین، جۆرە پەیوەندییەکی مەعنەویمان لە نێواندا چێدەکات. برادەری ئازیز، خۆزگە دەتزانی من چەند لە نەفامی و گێلی و نەزانی خەڵکی بێزارو بێتاقەتم، بریا دەتزانی هەر جارێ کە دەگەڵ تۆدا گفتوگۆ دەکەم چەند خۆشحاڵ و کەیف خۆش دەبم. تۆ پیاوێکی زیرەکی بۆیە زۆر لەزەت لە تێکەلاوی تۆ دەبینم، دۆستایەتی تۆم لە گیان خۆشە.

خوبوتوف، بە ئاستەم درزێکی خستە دەرگاکەو تەمەشایەکی نێو قاوشەکەی کرد. دکتۆری پیرو ئیڤان دمتریچ کە شەوکلاوێکی لەسەر بوو، لە تەنیشتی یەکەوە لەسەر تەختەخەوەکە ڕۆنیشتبوون! دیقەتی دا کابرای شێت بەدەم سیماگۆڕکێوە خۆی دەجولاندو شانەکانی هەڵدەتەکاند، و بەردەوام دیزداشەکەی توند وتوندتر لە خۆیەوە دەپێچا. کەچی دکتۆر سەری داخستبوو و بەبێ جوڵە دانیشتبوو، سیمای سوورو شەکەت و خەمناك دەهاتە بەرچاو. خوبوتوف، بەدەم شان هەڵتەکاندنەوە ،پۆزخەنێکی بۆ کردو تەمەشایەکی نیکیتای کرد.

نیکیتاش شانێکی بۆ هەڵتەکاند.

ڕۆژی دوایی خوبوتوف، پزیشکیارەکەی دەگەڵ خۆیدا هێنا، بە دوو قۆڵی لە ڕاڕەوەکەداو لە پشت دەرگای قاوشی ژمارە شەشەوە وەستان‌و گوێیان هەڵخست. پاش تۆزێك لەوێندەر وەدەرکەوتن، خوبوتوف بە دەم ڕێوە بە پزیشکیارەکەی گوت:

– وا تەسەور دەکەم بابە گەورەمان بە تەواوەتی تێکچووە.

سێرگی سێرگیوفیچی خۆشپۆشیش، کە هەوڵی دەدا بە هێواشی بەلای گۆلاوەکاندا تێپەڕێت تا پێڵاوە بۆیاخکراوو بریقەدارەکانی قوڕاوی نەبن، ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– خودای گەورە! لە گوناحی ئێمەی داماو خۆش بە! ئاغای یڤگینی فیدورڤیچ، چی بێ لە تۆ نهێنی، من لە مێژە چاوەڕوانی ئەم پێشهاتە بووم.

((١٢))

لەوە بە دواوە دکتۆر ئاندرێ یفیمیچ، بەرە بەرە کەوتە نامۆیی، هەستی دەکرد لە کەش‌و هەواو ژینگەیەکی گۆنگ‌و نهێنی ئامێزدا دەژی. کارمەندان‌و پەرستاران‌و نەخۆشانی خەستەخانەکە، کە دەیان بینی بە گومانەوە سەیریان دەکردو لە بەینی خۆیاندا دەکەوتنە چپە چپ. ماشا، کیژە چکۆلەکەی سەرپەرشتیاری دارایی‌و خەرجیات، کە دکتۆر زۆری خۆش دەویست‌و هەر جارێ لە حەساری خەستەخانەکەدا دیتبای دەچوو بۆ لای‌و دەستی نەوازشتی بەسەریدا دێنا، ئەمێستا هەرکە چاوی بە دکتۆر دەکەوت، کەس نەیدەزانی بۆچی قوشقی دەبوو و هەڵدەهات، میخاییل ئاڤریانیچ، سەرۆکی پۆستەخانە، ئێستا کاتێ کە گوێی لە قسەکانی دەگرت، وەکو جاران بە ئاوو تاو نەیدەگوت: "دەقاودەق وایە، ڕاستە فەرموویت" بەڵکو بە پەریشانی‌و نیگەرانی‌و بە بێتاقەتی‌و لە بن لێوانەوە مینگە مینگێکی بۆ دەکرد: "بەڵێ! بەڵێ!..." حایرو خەمبار دەیڕوانییە دۆستەکەی، بەردەوام ئامۆژگاری دەکرد کە خۆی لە خواردنەوەی بیرەو ڤۆدگا بپارێزێ، بەڵام چونکە پیاوێکی ناسك‌و بە ئەدەب بوو، ئەمەی بە ئاشکراو زەقی پێنەدەگوت، بەڵکو بە ئاماژەو کینایە تێی دەگەیاند. جا بۆ ئەم مەبەستە جارێ سەرگوزشتەی فەرماندەیەکی سوپایی‌و جارێ سەربهووردی کەشیشێکی بۆ دەگێڕایەوە کە چۆن بە هۆی زیادەڕۆیی لە بادەنۆشیدا نەخۆش کەوتوون‌و چۆن کە تەرکیان کردووە چاك بوونەتەوەو عەلەمیان نەماوە. لەم بەینەدا دکتۆر خوبوتوف-ش دوو سێ جار هاتە دیدەنی‌و ئامۆژگاری کرد کە خۆی لە خواردنەوەی مەشرووبات و کهولیات دوور بگرێت‌و بە خوت‌و خۆڕایی، پێشنیازی بۆ دەکرد کە برومیدی پوتاسیوم بەکار بێنێت*.

ئاندرێ یفیمیچ لە مانگی ئابدا، نامەیەکی لە سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوە پێگەیی، کە داوای لێکرد بوو بە مەبەستی گفتوگۆ لەسەر کارێکی گرینگ ، سەری ئەنجوومەنی شار بدات. کاتێ لە وەختی دیاریکراودا چوو بۆ ئەنجوومەن، سەیری کرد فەرمانداری سوپایی، سەرۆکی دایەرەی پەروەردە، یاریدەدەری ئەنجوومەنی شار، خوبوتوف‌و پیاوێکی قەڵەوی موو زەرد کە بە دکتۆر بانگیان دەکرد، هەموو لەوێندەر ئامادەن. ئەم ئاغای دکتۆرە کە ناوی شۆرەتی لە وشەێن پۆلاندی پێکهاتبوو و گوتنی لەسەر زمان زۆر قورس بوو، لە ئیدارەی چاکسازی نەژادی ئەسپ،

که له سێ فەرسەخی شاردا بوو کاری دەکردو هەر لەوێندەر ئاکنجی بوو، بە تەما بوو چەند ڕۆژێك لەم شارەدا بمێنێتەوەو بەسەر بەرێت. دوای سەلام‌و چاك‌و خۆشی‌و یەکتر ناسی، هەموو لە دەوری مێزێك دانیشتن، یاریدەدەری ئەنجوومەن رووی کردە ئاندرێ یفیمیچ‌و گوتی:

– یاداشتنامەیەکمان لەلایە کە بڕێك پەیوەندی بە کارەکانی تۆوە هەیە، یفگینی فیدوروڤیچ دەڵێت کە شوێنی دەرمانخانەکە لە بینای ئەسڵی خەستەخانەکەدا زۆر بچووك وتەنگە، پێویستە بگوازێتەوە بۆ یەکێك لە قاوشەکان، هەڵبەتە گواستنەوەی دەرمانخانەکە کارێکی زۆر قورس‌و زەحمەت نییە، کێشەی گەورە لەوەدایە کە قاوشەکە پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەیە.

ئاندرێ یفیمیچ، تاوێك لە فکران ڕاچوو و گوتی:

– بەڵێ، هەق بە تۆیە، بەبێ نۆژەنکردنەوە بە کەڵك نایەت. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ ئەو ژوورەی دەستەچەپی بینا سەرەکیەکە بکەین بە دەرمانخانە. پێموایە بەلای کەمەوە پێنج سەد ڕۆبڵی دەوێ بۆ نۆژەنکردنەوە، کە مەسرەفێکی بێفایدەیە.

بێدەنگی، بۆ ماوەیەکی کورت باڵی بەسەر هەمووواندا کێشا. ئاندرێ یفیمیچ هێدی هێدی درێژەی بە قسەکەی خۆی داو گوتی:

– من شانازی بەوە دەکەم کە دە ساڵ لەمە پێش خەبەرم دایتێ کە ئەم نەخۆشخانەیە بەم وەزع‌و حاڵەی ئێستایەوە نوقستانی یەجگار زۆرە، زیادە مەسرەفێکە کە شار دەرەقەتی نایەت. ئەم نەخۆشخانەیە لە ساڵی ١٨٤٠ دا هاتووەتە دامەزراندن‌و ، ئەوسا ئەم ئامێرو ئیمکاناتەی ئەمڕۆ لە ئارادا نەبوون. ئەم شارە پارەیەکی یەجگار زۆر لە دروستکردنی بینای نا زەروری‌و کاروباری زیادە خەرج دەکات، بە بۆچوونی من دەشیا بەم پارەیە، لە هەلومەرجێکی جۆاکی دیکەدا، بەلای کەمەوە دوو نەخۆشخانەی نموونەیی، بێ هیچ کەموکوڕییەکی پزیشکی، دروست بکرێت‌و بەڕێوە ببرێت.

یاریدەدەری ئەنجوومەن بە گەرم و گوڕی گوتی:

– دەیسا، وەرن با ئەم هەلومەرج‌و پلانە نوێیە بڕەخسێنین!

ئاندرێ یفیمیچ، گوتی:

– بەندە هەر زوو پێشنیازی ئەوەم کرد کە با ئیدارەو سەرپەرشتی‌و بەڕێوەبردنی دەزگا تەندروستییەکان بە ئەنجوومەنی شار بسپێردرێت.

دکتۆرە موو زەردەکە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

– بەڵێ ئاغا، بودجەی خەستەخانەکان بخەنە بەر دەستی ئەنجوومەنی شار تا دوا پولی بدزن‌و بخۆن.

نوێنەری ئەنجوومەنی شارەوانیش پێکەنی‌و قسەکەی دکتۆری تەسدیق کرد:

– بێگومان، دزییان دەگەڵ شیر مژتوە.

ئاندرێ یفیمیچ، نیگای پەژمردەو خەمناکی بڕییە دکتۆرە موو زەردەکەو گوتی:

– پیاو نابێ بەخۆڕایی لە عەلەیی خەڵك بلێ، ئینساف شتێکی باشە.

دیسان بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان. چایان هێنا، فەرمانداری سوپایی، بە شپرزەییەکی زۆرەوە، دەستی بەسەر مێزەکەدا درێژکردو خستیە سەر دەستی ئاندریێ یفیمیچ و گوتی:

– دکتۆر، وادیارە بەتەواوەتی ئێمەت فەرامۆش کردووە. وەکو ڕەبەن و تەرکە دنیایان دەژیت، توخنی وەرەق ناکەوی، حەز لە ژن و ژنبازی ناکەیت، وادیارە بە تێکەڵاوی خەڵکی وەکو ئێمە بێتاقەت دەبیت.

ئیدی هەموو ئامادەبووان، یەك یەك کەوتنە باسی ئەوەی کە پیاوی ماقووڵ و ڕێك و پێك لەم شارەدا بێتاقەت دەبێت. چونکە نە شانۆی تیایە، نە موزەخانە،و نە کۆنسێرتی تیادەکرێت، تەنانەت لەو دوا کۆڕو ئاهەنگی سەمایەشدا کە لە یانەکەدا کرابوو، تەنیا بیست ژن و دوو پیاو ئامادە بوو بوون.. گەنجەکان ناچنە کۆڕی سەما. یان لە مەیخانەکاندا کەوتوون یان خەریکی قومارن. ئاندریێ یفیمیچ، بێئەوەی تەمەشای کەس بکات، هێدی و هێمن دەستی بە قسان کردو داخ و کەسەری بۆ ئەوە دەخوارد کە خەڵکی شار، هەموو هۆش و گۆش و هەست و نەستیان بە قومارو غەیبەت، بە فیڕۆ دەدەن. نایانەوێ و ناتوانن وەختی خۆیان بە گفتوگۆی جوان و باش و خوێندنەوەو موتاڵای کتێبان بەرنەسەر، نایانەوێ سوودو لەزەت لە داهێنانەکانی ئەقڵی بەشەری وەربگرن. تەنیا ئەقڵ ودەسکەوتە ئەقڵییەکان شتن، ئەوی دی هەمووی پەشمە.

دکتۆر خوبوتوف کە بە وردی گوێی لە قسەو بۆچوونەکانی، هاوکارەکەی دەگرت، لە ناکاودا پرسی:

– ئاندریێ یفیمیچ، ئەمڕۆی چەندی هەیڤە؟

پاش ئەوەی ئاندریێ یفیمیچ، وەڵامی دایەوە، خوبوتوف و دکتۆرە موو زەردەکە، وەکو ئەوەی پەیان بە بێ مانایی پرسیارەکەی خۆیان بردبێ و، بۆ ئەوەی تەریقی خۆیان بشارنەوە، کەوتنە کۆمەڵێك پرسیاری تری وەك: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ یان ساڵ چەند ڕۆژە؟ یان ئایا ڕاستە پێغەمبەرێکی شایستەو بەڕێز لە قاوشی ژمارە شەشدا دەژی؟ ئاندریێ یفیمیچ، بە دەم وەڵامدانەوەی دوا پرسیارەوە سوور بووەوەو گوتی:

– بەڵێ، هەرچەندە نەخۆشە، بەڵام بەڕاستی گەنجێکی شایستەیە. ئیدی پرسیاری دیکەیان لێنەکرد.

لەو کاتەدا کە ئاندریێ یفیمیچ لە دالانەکەدا مژولی لەبەرکردنی پاڵتۆکەی بوو، فەرمانداری سوپایی دەستی خستە سەر شانی و ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– وەختی ئەو هاتووە ئێمەی پیر خانەنشین ببین و ئیدی ئیسراحەت بکەین.

کاتێ ئاندریێ یفیمیچ، لە بینای ئەنجوومەنی شار دەهاتە دەرێ، یەکسەر زانی ئەم کۆبوونەوەیە بۆ تاقیکردنەوەی حەواس جەمی و توانای فیکری ئەو ساز درابوو، ئەو پرسیارانەی وەبیر خۆی هێنایەوە کە لێیان کردبوو، ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو بۆ یەکەمین جار لە هەموو تەمەنی خۆیدا بەزەیی بە حاڵی زانستی پزیشکیدا هاتەوە.

لە کاتێکا بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەو دکتۆرانە ئەویان تاقی کردووەتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "خودایە، خۆ ئەمانە بە ناخێریان زۆر نییە بەشی دەروونناسی پزیشکییان تەواو

کردووه، ئیمتیحانیشیان تیا داوەو دەریش چوون، باشە بۆچی ئەوەندە نەزانو جاهیلن؟ بۆچی کەمترین زانیارییان لەمەڕ نەخۆشی دەروونی نییە؟

دکتۆر ئاندریێ یفیمیچ، بۆ یەکەمجار لە ژیانی خۆیدا هەستی بە سووکایەتی کرد، لە دڵی خۆیدا زۆر توڕە بوو.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، میخاییل ئاڤریانیچ هات بۆ لای، بێ ئەوەی سڵاوو ئەحواڵپرسی بکات، خۆی گەیاندە ئاندریێ یفیمیچ، هەردوو دەستی وی لە نێو دەستەکانی خۆی ناو بە شپرزەییو نیگەرانی گوتی:

– برادەری ئازیز! گیانەکەم! بۆمی بسەلمێنە کە تۆ، من دۆستی خۆت دەزانی، متمانەت بە دڵسۆزیو دۆستایەتیم هەیە... دۆستی ئازیز!

ئەوسا بێئەوەی دەرفەتی قسەکردن بە ئاندریێ یفیمیچ بدات، لەسەر قسەکانی خۆی ڕۆییو گوتی:

– من بۆیە تۆم خۆش دەوێ چونکە کەسێکی خوێنەوارو دڵپاكو میهرەبانو بە بەزەییو بە تەربێتی. گیانەکەم! گوێ لە من بگرە بزانە چ دەڵێم! ئیتیکی پیشەیی وادەخوازێت کە دکتۆرەکان، حەقیقەتو ڕاستیەکان لە تۆ بشارنەوە. بەڵام من بە حوکمی ئەوەی سەربازم، ڕێكو ڕەوانو بێ پەردە پێت دەڵێم کە تۆ نەخۆشیت. برادەری ئازیز بمبوورە! بەڵام ئەم مەسەلەیە حەقیقەتێکە ئاو لێڵ ناکاتو هەموو ئەوانەی دەوروبەرت ماوەیەکە پەیان بە نەخۆشییەکەت بردووە. ئەمڕۆکە دکتۆر یفگینی فیوروفیچ پێی گوتم کە تۆ بۆ سەلامەتیو ساغڵەمی خۆت پێویستت بە ئیسراحەت و گەڕانە. هەڵبەتە هەق بەوە! جا من بە تەمام لەم ڕۆژانەدا، مادوونی وەربگرمو بچمە گەڕانو هەوایەك بگۆڕم. جا تۆش بیسەلمێنە کە بەڕاستی دۆستی منیتو لەگەڵما وەرە. بڕۆینو بە یادی ڕۆژگاری گەنجی، بای باڵێکی خۆمان بدەین.

ئاندریێ یفیمیچ بۆ ساتێك لە فکران ڕاچوو و گوتی:

– بە پێچەوانەوە، هەست دەکەم عەیبم نییە، ساغو سەلامەتم. من ناتوانم لەگەڵتا بێم، بەڵام ڕێم بدە با بەشێوەیەکی دیکە دۆستایەتیو دڵسۆزی خۆمت بۆ بسەلمێنم.

ئەم سەفەرە کوتو پڕەو، بۆ شوێنێکی نادیارو، بەبێ هیچ هۆیەکی تایبەتیو، بەبێ کتێبو بەبێ داریوشکاو بەبێ مەشرووبو بیرە، دەیکردە شێوانی نەزمو زاکونی ژیانی ئەو، ئەو ژیانەی کە بیست دانە ساڵی خشت بوو، خووی پێوە گرتبوو! لە سەرەتادا، تەنانەت وێناو تەسەوری ئەم کارەشی بەلاوە زۆر سەیرو خەیاڵاوی و زەحمەت بوو. بەڵام لەناکاودا، گفتوگۆی کۆبوونەوەکەی ئەنجوومەنی شارەوانیو ئەو خەمو پەژارەیەی کە لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە، سەرو دڵی گرتبوو، وەبیر هاتەوەو ئەمە وای لێکرد، بیر لەوە بکاتەوە بۆ ماوەیەك لەو شارە بڕوات، لە شارێك کە دەستەیەك خەڵکی کەودەنو گەوجو جاهیلو نەزانی ئەوێندەر، بەشێتیان دەزانی. بۆیە لە میخاییل ئاڤریانیچی پرسی:

– بە تەمای بۆ کوێ بڕۆیت ؟

– بۆ مۆسکۆ، پترزبۆرکو بۆ وارشۆ. من خۆشترین پێنج ساڵی ژیانم له وارشۆ قەتاندووه. بەڕاستی شارێکی خۆشو ئەفسوناوییە! دەی گیانەکەم، بڕیاری خۆت بدەو لەگەڵما وەرە.

((١٣))

دوای یەك هەفتە داوایان لە ئاندریێ یفیمیچ کرد کە بچێتە ماڵەوەو ئیسراحەت بکات، یانی بە گوتەیەکی دی ئیستیقالە بداتو دەستبەرداری کارەکەی ببێت.

دکتۆر بەوپەڕی خوێنساردیو بێ منەتی ئەم هەڵوێستەی قەبووڵ کردو، هەفتەی دواتر، دەگەڵ میخاییل ئاڤریانیچدا، سواری گالیسکەکەی پۆستەخانە بوو و،بەرەو نزیکترین وێستگەی قیتار کەوتە ڕێ. دنیا فێنكو مایل بە سەرما بوو، ئاسمان سافو شین بوو. ئاسۆی دوور ڕوناك دەینواند. بە دوو ڕۆژان، دووسەد فەرسەخەکەی نێوان شارو وێستگەی قیتارەکەیان بڕی، بەڵام شەوێ لە دوو قۆناغی پۆستەخانەدا بۆ ئیسراحەتو نووستن لایان دا.

ئەگەر لە قۆناغەکاندا چایان لە کوپی پیسدا بۆ هێنابان، یان درەنگ ئەسپەکانیان داکردبا، یان لە گالیسکەکەیان بەستبا، میخاییل ئاڤریانیچ دەهری دەبوو، سیمای سوور هەڵدەگەڕاو دەلەرزیو هاواری دەکرد: "بێدەنگ! گوێم لە قسەتان نەبێ!" لە نێو گالیسکەکەشدا، بۆ تاقە ساتێ دەمی لێك نەدەنا، لێکدا لێکدا باسی سەفەری خۆی، بۆ قەفقازو وڵاتی پۆڵاندا، دەکرد، باسی ڕیسكو ڕیسککاریەکانی خۆی، دەکرد. باسی ئەو خەڵکانەی دەکرد کە ئاشنایەتی دەگەڵ پەیدا کردبوون. هەموو ئەوانەی بە دەنگی بەرز دەگێڕایەوەو بە دەم قسەکردنەوە، چاوی بە شێوەیەکی حیرەتامێزی ئەوتۆ دەکرانەوە، کە گوێگر وای تەسەور دەکرد کە درۆو فشان دەکات. ئەمە جگە لەوەی کاتێ کە قسەی دەکرد هەناسەی بەر دەمو چاوی ئاندریێ یفیمیچ دەکەوتو لە پەنای گوێی ئەودا، لە قاقای پێکەنینی دەداو، ئەمەش دکتۆری بێزارو ناڕەحەت دەکردو نەیدەتوانی حەواسو بیرێن خۆی جەم بکات.

لە درێژەی سەفەرەکەیانداو بۆ ئەوەی کەمێك پاشەکەوت بکەن بلیتی نمرە سێی قیتاریان بڕی بوو. فارگۆنێکیان هەڵبژارد کە سیغارکێشان تیایدا قەدەغە بوو. نیوەی ڕێبوارەکان خەڵکی پۆشتەو پەرداخو پاكوخاوێن بوون. میخاییل ئاڤریانیچ زوو بە زوو ئاشنایەتی دەگەڵ هەموویاندا پەیدا کردو لەم تەختەوە دەچوو بۆ ئەو تەختو بە دەنگی بەرز دەیگوت: "هەق نییە خەڵکی بەم جادە نا ئەمنانەدا سەفەر بکەن، پیاو لەبەر دزو درۆزن جێ بەخۆی ناگرێت! سەفەر بە گالیسکە سەد قاتی سەفەر بە قیتار، باشترو ئەمینترە. ئەگەر ڕۆژی سەد فەرسەخیش ببڕیت، هەست بە بێتاقەتیو ماندوو بوون ناکەیت. هۆی وشکە ساڵی ناوچەکە ئەوەیە کە مرداوو قۆپییەکانی پینسکایایان وشك کردووە. بەشێوەیەکی گشتی بێ نەزمیو پاشاگەردانیو ئاژاوەیەکی سەیرو ترسناك باڵی بەسەر ئەم وڵاتەدا کێشاوە.". ئیدی ئەم پیاوە سوور دەبووەوەو توڕە دەبوو و هەژدەر هەژدەر قسەی دەردەفرتاندو دەرفەتی قسەکردنی بە کەس نەدەدا، چەنەبازی بێ پایانو قاقای پێکەنینو جوڵاندنی دەستو سەری، بەجۆرێ ئاندریێ یفیمیچی جاڕزو وەڕزکرد، کە بە کەسەرو داخێکی زۆرەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "توخوا کێمان شێتین؟ من شێتم کە هەوڵدەدەم بە هیچ کلۆجێ ڕێبوارانی ناو فارگۆنەکە بێزارو ناڕەحەت نەکەم یان ئەم

پیاوە خۆ پەسندە، کە لە ناو ئەو خەڵکەدا لە هەمووان خۆی پێ زاناترەو ئیسراحەتی لێ هەڵگرتوون؟"

کە گەییشتنە مۆسکۆ، میخاییل ئاڤریانیچ، جلکی سوپایی لەبەر کرد: بە چاکەتێکی بێ کەتافیەو قەیتانی لابالٚ، پانتۆڵێکی بە قیراجی سوورو کلاوێکی سوپاییەوە ڕێی دەکردو سەربازان هەرکە بە رێکەوت دەیانبینی، ئیکلامی سوپاییان بۆ دەکرد. دکتۆر وای هەست دەکرد کە ئەم پیاوە هەرچی سیفەتو خەسڵەتی پەسندو پیاوانەی دێهاتیانەی ڕابردووی خۆی هەیە، فەرامۆشی کردووەو تەنیا سیفەتە خراپەکانی پاراستووە. میخاییل ئاڤریانیچ حەزی دەکرد کە خەڵکی تەنانەت لە کاتی نازەرووریپیشدا خزمەتی بکەن. بۆ نموونە ئەگەر شخارتەیەك لەسەر مێزەکەو لەبەر چاویا بوایەو دەستیشی پێ گەییشتبا، پێشخزمەتەکەی بانگ دەکرد کە شخارتەکەی بداتە دەست. بە بەرچاوی کارەکەرە گەنجەکانەوە، بە تۆی دەرپێ قوتەیەکەوە دەسوڕایەوەو هیچ تەریق نەدەبووەوە، هەموو پێشخزمەتەکانی بێ ریزپەڕ، تەنانەت ئەگەر پیرەمێرێکی هەفتا ساڵەش بوایە بە ناوی ڕووتی خۆیانەوە بانگ دەکردو کاتێ کە توڕەش بوایە هەزارویەك جنێوی سەر بە کوڵکەی وەك "کەرە"و "گەوجە"ی پێدەدان. ئاندرێ یفیمیچ دەیزانی هەر هەموو ئەم رەفتارانە، رەفتاری ئاغایەکی دێهاتیە، بەڵام قێزی لێی دەهاتەوەو بە ڕەفتارێکی نابەجێ‌و نا پەسندی دەزانی.

میخاییل ئاڤریانیچ، هەرکە گەیینە مۆسکۆ، بەر لە هەر شتێك دکتۆری بۆ کلێسای (ئیڤرسکایا) برد، لەوێندەر دوعاونزای کرد، پاڕایەوە، کڕنووشی بۆ ئیکونەی پیرۆز برد، فرمێسکی هەڵڕشتو گریا، کاتێ کە نوێژو نزای تەواو بوو، لە کانگای دڵەوە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئەگەر ئینسان باوەڕو ئیمانیشی نەبێت، دوای هەر نوێژو نزایەك هەست بە ئارامیو ئاسوودەییەکی زیاتر دەکات. برای ئازیز تۆش ئەم ئیکۆنەیە ماچ بکە، کڕنۆشی بۆ ببە.

دکتۆر، بەو قسەیە لە ڕووداما، بە هەر شەرمو ڕووگیرییەك بوو کڕنۆشی بۆ ئیکۆنەکە برد، بەڵام میخاییل ئاڤریانیچ، دەمو لێوی هێنایەوە یەك، بە کوڵ‌و دڵ کەوتە سەر بادانو وێرد خوێندن،و ڕوندك لە چاوانی هاتنە خوارێ. پاشان چوون بۆ کۆشکی کرملینو لەوێندەر تەمەشای گەورەترین تۆپو گەورەترین زەنگیان کرد کە بە شای تۆپانو شای زەنگان بە ناوبانگ بوون. نەك هەر تەمەشایان کردن بەڵکو دەستیانیش پێدا هێنان، ئەوسا چوونە تەمەشای روبارە جوانەکەی مۆسکۆ، پاشان چوون بۆ پەرستگەی سپاستیلو موزەخانەی رومیانتسفسکی.

لە میوانخانەی تستوف نیوەڕۆژەیان کرد. میخاییل ئاڤریانیچ کە پەیتا پەیتا دەستی بە ڕدێنی خۆیدا دێنا، ماوەیەك تەمەشای لیستی خۆراکەکانی کرد، ئەوسا وەکو کەسێکی خۆشخۆرو بە سەلیقە، ئاسوودەو ڕەحەت وەکو ئەوەی لە ماڵی خۆیدا بێت بە گارسۆنەکەی گوت:

– فریشتەکەم! حەزدەکەم بزانم ئەمڕۆ چ خواردنێکمان دەدەیتێ!



دکتۆر لە هیچی کەم نەبوو، پیاسەی دەکرد، دەگەڕا، تەمەشای دەکرد، دەیخوارد، دەیخواردەوە، بەڵام هەستی دەکرد دەگەڵ میخاییل ئاڤریانیچدا بێتاقەتە، لێی بێزارە، حەزی

دەکرد ساتێ بە تەنیا بێ و پشوویەك بدات، لە هاوڕێکەی جیا بێتەوەو خۆی لەو بدزێتەوە. بەڵام هاوڕێکەی بە پێچەوانەوە، خۆی بەوە دەزانی کە لە سەرێتی بەبست لێی دوور نەکەوێتەوەو ئەوەندەی دەتوانێت، زەمینەی سەرگەرمی کەیف و خۆشی بۆ فەراهەم و خۆش بکات. ئەگەر بۆ شوێنێکیش نەڕۆیشتبان، هەوڵی دەدا دکتۆر بە قسەو گفتوگۆیان سەرگەرم و مژول بکات. ئاندریێ یفیمیچ هەر تا دوو رۆژ ئەو وەزع و حاڵەی تەحەمول کرد، رۆژی سێیەم بە هاوڕێکەی خۆی گوت کە نەخۆشەو حەزدەکات ئەو رۆژە تا ئێوارێ هەر لە ماڵەوە بێت. بەڵام هاوڕێکەی گوتی کەواتە ئەویش ناچێتە دەرێ و، مرۆڤ پێویستە پشوویەکیش بدات دەنا لە پەلوپۆ دەکەوێ. ئاندریێ یفیمیچ لەسەر موبیلەکە، ڕوو لە دیوارەکە ڕاکشا، ژێراو ژێر دانەکانی لێکدی دەسوو و بە بێزاری گوێی لە قسەکانی هاوڕێکەی دەبوو، کە زۆر بە کوڵ و بەجۆش، بە ئاو وتاو هەوڵی دەدا پێی بسەلمێنێ کە بێگومان فەرەنسا درەنگ یان زوو، بەسەر ئاڵمانیادا زاڵ دەبێت ، کە ژمارەی دەستبڕو گیرفانبڕ لە مۆسکۆدا یەجگار زۆرە، کە ئەسپ بە ڕەنگ و رواڵەت نایەتە هەڵسەنگاندن.

دکتۆر بەرە بەرە هەستی دەکرد گوێی دەزرنگێتەوە، دڵی کەوتووەتە تەپە تەپ، بەڵام ئەوەندە بە ئەدەب و نەزاکەت بوو. دڵی نەدەهات بە هاوڕێکەی بڵێ کە بە تەنیا جێی بێڵێ یان بەلای کەمەوە تۆزێ بێدەنگ بێت و ئەوەندە قسان نەکات. خۆشبەختانە میخاییل ئاڤریانیچ، لە ئوتێل بێتاقەت بوو و دوای فراڤین چووە دەرێ تا کەمێك بگەڕێ و سڕی پێی دەربکات.

ئاندریێ یفیمیچ، کە تامەزرۆی ئیسراحەت بوو، کاتێ بە تەنیا مایەوە، بە تەواوەتی خۆی رادەستی ئەو ئارەزووەی کرد. ئەلهەقی پاڵکەوتن بەبێ جوڵەو، هەست کردن بە تەنیایی، شتێکی یەجگار خۆشە! شادمانی ڕاستەقینە بەبێ گۆشەگیری و تەنیایی مەحاڵە. بێگومان، ئەهریمەن، ئەو فریشتە تڕۆکراوە، لەبەر ئەمە خیانەتی لە یەزدان کرد، چونکە یەجگار تاسەمەند و تامەزرۆی تەنیایی بوو و، عەودالی ئەم نیعمەتە گەورەیە بوو، کە فریشتەکان لێی بێبەش بوون. ئاندریێ یفیمیچ دەیویست لە تەنیاییدا بیر لەو شتانە بکاتەوە کە لەو چەند رۆژەی ڕابردوودا دیتبوونی و بیستبوونی، بەڵام نەیدەتوانی، چونکە هەمیشە سەروسیمای میخاییل ئاڤریانیچی لە بەرچاو بوو،و بەغەم و کەسەرەوە بە خۆی دەگوت: "باشە تۆ بڵێی ئەم پیاوە تەنیا لەبەر خاتری دۆستایەتی و لە ڕووی جوامێری و پیاوەتییەوە، مادوونی وەرگرتبێ و ملی بەم سەفەرەوە نابێ! بەڵام لە دنیادا هیچ شتێك لە سایەداری دۆستانە قۆڕتر نییە! دروستە میخاییل ئاڤریانیچ، پیاوێکی میهرەبان و دلۆڤان و خۆش مەشرەب و جوامێرە، بەڵام مێشکی سەرت دەبات و پیاو بێتاقەت دەکات. ئەم جۆرە خەڵکانە هەمیشە هەوڵدەدەن کە قسەی جوان و ئاقڵانە بکەن، لێ گوێگر یەکسەر هەستدەکات کە ئەوانە کەودەن و گەوجن."

ڕۆژانی دواتریش ئاندریێ یفیمیچ، هەر بە درۆ خۆی دەکرد بە نەخۆش و لە ژوورەکەی خۆی نەدەچووە دەرێ. هەرجارێ ئاڤریانیچ هەوڵی دابا سەرگەرمی بکات و قسانی بۆ بکات، لەسەر کەتەکە(تەختە خەو) دەکەوتە سەر لاو ڕووی دەکردە دیوارەکەو ناڕەحەت دەبوو، لێ هەرکە ئاڤریانیچ دەچووە دەرێ، هەناسەی ئۆخەی هەڵدەکێشا و خۆشحاڵ دەبوو،ودەکەوتە سەرزەنشتی خۆی کە بۆچی ملی بۆ ئەم سەفەرە دابوو وکە دەیبینی هاوڕێکەی رۆژ بە رۆژ چەنەبازترو،

سوێرە قسان تر دەبێت، دڵتەنگو خەمبار دەبوو. بۆیە بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی حەواسی خۆی جەمو بیری کۆنترۆڵ بکاتو بیر لە بابەتێن جددیو گرینگ بکاتەوە.

ئاندرێ یفیمیچ، کە لە وەزعو حاڵو خوڵقو خووی خۆی بێزار دەبوو، لەفکران ڕادەچوو و، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "لەوە دەچێ، قسەکانی (ئیڤان دمتریچ)م لێ بێنە دی. بەڵام نا! بێهودە خۆم نیگەران دەکەم.... هەر ئەوەندەم ئەستەمە تا دەگەڕێمەوە ماڵێ، ئیدی هەموو شتێك دەگەڕێتەوە سەر بارو دۆخی جارانی خۆی..."

لە پترسبۆرگیش هەمان تاسو هەمان حەمام بەردەوام بوو، بە ڕۆژەوە لە ژوورەوەکەی خۆی نەدەچووە دەرێ. لەسەر کەتەکە ڕادەکشا، مەگەر بۆ بیرە خواردنەوە هەستابا دەنا لە جێی خۆی نەدەجولا.

میخاییل ئاڤریانیچ، بەردەوام پەلەی لێدەکرد تا هەرچی زووترە بگەنە وارشۆ. لێ دکتۆر، بە پاڕانەوە لێی دەپاڕایەوەو تکای لێدەکرد کە:

– برادەری ئازیزم! ئاخر من چ ئیشم لە وارشۆیە؟ خۆت بە تەنیا بڕۆ، با من بۆ ماڵەکەی خۆم بگەڕێمەوە. تکات لێدەکەم، ڕێگەم بدە کە بۆ ماڵ بگەڕێمەوە!

لێ میخاییل ئاڤریانیچ، بەرپەرچی دەدایەوەو دەیگوت:

– نا، بە هیچ جۆرێ بە تەنیا جێت ناهێڵم. تۆ نازانی وارشۆ چ شارێکی جوانو پڕ ئەفسوونە. من خۆشترین پێنج ساڵی تەمەنم لەوێندەر قەتاندووە.

هەڵبەتە دکتۆر، ئەوەندەی ئیرادە نەبوو کە بتوانێ قسەی خۆی بباتە سەر، بۆیە ناچار بەرەو وارشۆ بەگەڵ هاوڕێکەی کەوت. لەوێش لە ژووری ئوتێل نەدەهاتە دەرێ، لەسەر کەتەکەی (تەختە خەو) ڕادەکشاو، لە دەستی خۆیو میخاییل ئاڤریانیچ و گارسۆن وبۆیە پۆڵاندییەکان، کە بەوپەڕی سەر سەختی و عینادی نەیاندەویست لە زمانی روسی بگەن، بێزارو توڕە دەبوو. بەڵام میخاییل ئاڤریانیچ وەکو هەمیشە چالاکو چەلەنگو گەشو تەندروستو دڵتەڕ دەهاتە بەرچاو لە بەیانییەوە تا شەوێ بەناو شارا دەسوڕایەوەو تاقیبو سۆراخی کۆنە دۆستو ناسیاوەکانی خۆی دەکرد. چەند شەوێکیش تاکو بەیانی بۆ ئوتێل نەگەڕایەوە. دوای شەوێك کە دیار نەبوو لە کوێ وچۆنی بەسەر برد بوو، لە سپێدەدا بۆ ئوتێل گەڕایەوە، دەموچاوی سوور هەڵگەڕا بوو، سەرو قژی شێوا بوو و، غەزەبو توڕەیی لێدەباری. ماوەیەکی زۆر بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، لە بن لێوانەوە مینگە مینگێکی نا مەفهوومی دەکرد، پاشان وەستاو گوتی:

– شەرەفو ئابڕووی مرۆڤ لە سەروو هەموو شتێکەوەیە.

دووبارە بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، دەستی نایە قژی خۆیو بە خەمینیەکی زۆرەوە گوتی:

– بەڵێ، شەرەفو ئابڕوو لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە! نەفرەت لەو ساتەی، کە بیری سەفەری ئەم وێرانەیەم (بابل) کەوتە سەرم.

ئەوسا رووی کردە دکتۆر و گوتی:

– برادەری ئازیز، تا دەتوانی سەر کۆنەم بکە! چونکە هەرچی دارو نەدارم هەیە لە قومارا دەمناوە! پێنج سەد رۆبڵم بە قەرز بدەیە!

ئاندرێ یفیمیچ، بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بكات پێنج سەد ڕۆبڵی ژماردو دایە دەستی هاوڕێكەی. میخاییل ئاڤریانیچ كە هێشتا دەموچاوی لە شەرماو لە قارا سوورهەڵگەڕا بوو، بەدەم ورتە ورتێكی نا مەفهوومو پچڕ پچڕەوە هەندێ سوێندی بێهودەو نابەجێی خوارد. كڵاوەكەی لە سەر كردو بەلەز لە ژوورەكە وەدەركەوت. دوای دوو سەعاتان بۆ ئوتێل زڤرپییەوە، خۆی دا بەسەر كەتەكەدا. ئاهێكی قووڵی هەڵكێشاو گوتی:

– باش بوو حەیاو حەیسیەتی خۆم كڕییەوە، برادەری ئازیز! واچاكە تا زووە لێرە بڕۆین! حەز ناكەم بۆ تاقە دەقیقەیەكیش لەم شارە شوومەدا بمێنم. هەموویان دەستبڕو دزن! جاسووس‌و هەواڵدزی نەمسان!.

مانگی یازدە بوو، بەفرێكی قورس جادەوبانی گرتبوو، كە جووتە هاوڕێ بۆ شارەكەی خۆیان گەڕانەوە. پۆست‌و كارەكەی (ئاندرێ یفیمیچ)یان بە دكتۆر خوبوتوف سپاردبوو. هێشتا لە خانووەكەی جارانی خۆیدا بوو، چاوەڕوان بوو ئاندرێ یفیمیچ لە سەفەرەكەی بگەڕێتەوەو ژوورەكانی نەخۆشخانەكەی بۆ چۆڵ بكات. ئەو ژنە ناشیرینەی، كە خوبوتوف لە هەموو شوێنێ بڵاوی كردبووە گوایە چێشتچییەتی، لە یەكێك لە شوقەكانی نەخۆشخانەكەدا ئاكنجی بوو بوو.

لە شارا دەنگۆیەكی تازە دەربارەی وەزع‌و حاڵی نەخۆشخانەكە دەماو دەمی دەكرد. دەیانگوت كە ئەم ژنە ناشیرینە دەگەڵ سەرپەرشتیاری نەخۆشخانەكەدا بە شەڕ هاتووەو دەمەقاڵەو قەرقەشەیان بووەو لە ئەنجامدا یارۆی سەرپەرشتیار، خۆی لەبەر پێیانی هاویشتووەو داوای بووردنی كردووە.

ئاندرێ یفیمیچ، هەر لە یەكەم ڕۆژی هاتنەوەیدا بۆ شار، ناچاركرا، بچێ بۆ خۆی ماواو سوكنەیەك پەیدا بكات. سەرۆكی پۆستەخانە بە شەرم‌و شكۆوە لێی پرسی:

– دۆستی ئازیز! داوای بووردن دەكەم‌و نەبێ بەبێ ئەدەبێ، حەزدەكەم بزانم وەزعی داراییت چۆنەو چیت هەیە؟.

ئاندرێ یفیمیچ، بێ چەندوچوون پارەكانی ژمارەدو گوتی:

– هەشتاو شەش ڕۆبڵم هەیە.

میخاییل ئاڤریانیچ، كە لە مەبەستی دكتۆر تێ نەگەیی بوو، بە شەرمێكەوە گوتی:

– مەبەستم ئەو بڕە پارەیە نییە كە پێتە، دەمەوێ بزانم كۆی هەموو پارەكانت چەندە.

– عەرزم كردیت كە لە دارای دنیادا تەنیا ئەو هەشتاو شەش ڕۆبڵەم هەیە....

میخاییل ئاڤریانیچ، هەرچەندە دكتۆری بە پیاوێكی شەریف‌و پاك‌و دروستكار دەزانی، بەڵام وێڕای ئەمەش پێی وابوو كە دەبوایە بەلای كەمەوە خاوەنی بیست هەزار ڕۆبڵی وشەكە بێت. بەڵام نها كە پەی بە دەستكورتی‌و نەداری ئاندرێ یفیمیچ بردبوو، لە پڕێكاو، بێ هیچ هۆیەكی دیار، لە هۆڕژنی گریانی داو، دەستی لە ملی هاوڕێكەی وەرینا.

((١٥))

ئاندرێ یفیمیچ، گواستیەوە خانووەیەكی چكۆلە، كە سێ پەنجەرەی هەبوو، ئەم خانووە هی بێوەژنێكی كاسبكار بوو بە نێوی بلیۆڤایا. ئەم خانووە چكۆلەیە بریتی بوو لە سێ هۆدەو

مووبەقێك. دكتۆر ئەو دوو ژوورەی بەكرێ گرت، كە پەنجەرەكانیان دەیانڕوانیە سەر جادەكە. داریوشكاو خاوەن ماڵەكەو سێ منداڵەكەی لە ژووری سێیەمو مووبەقەكەدا دەژیان. هەندێجار ماشوقو دۆستی بێوەژنەكە، دەهات كە شەو دەگەڵ ئەودا ڕابوێرێ. ئەمە كە بابایەكی فەلاحی بەدمەستو بەدفەڕو شەڕەنگێز بوو، نیوەشەو دەیكرد بە هەراو هەنگامەو ریسواییەكی ئەوتۆ كە داریوشكاو منداڵەكانی لە ترسا شپرزەو پەریشان دەبوون. ئەم پیاوە هەركە سەروسەكوتی پەیدا دەبوو و، دەچوو لە مووبەقەكە دادەنیشتو داوای ڤۆدگای دەكرد، هەموو زیرەیان لێدەكرد، دكتۆر لە ڕووی دلۆڤانیو بەزەییەوە منداڵە چاو بە گریانەكانی خاوەن ماڵەكەی دەبردنە ژوورەكەی خۆیو لە عاردەكە جێگەی بۆ ڕادەخستنو دەی خەواندنو، زۆر دڵی بەم كارە خێرەی خۆی خۆش بوو.

ئاندرێ یفیمیچ، وەكو جاران سەعات هەشتی بەیانی لە خەو ڕادەبوو و دوای نانو چای بەیانی، دەكەوتە خوێندنەوەی كۆنە كتێبو گۆڤارەكانی خۆی، چونكە هەنووكە ئەو پارەیەی نەبوو كە كتێبو گۆڤارێن تازە بكرێت. ئێستا خوێندنەوە وەكو جاران سەرنجی ڕانەدەكێشاو، زوو ماندوو دەبوو، ئیدی دیار نەبوو، لەبەر كۆنی كتێبەكان بوو یان لەبەر نالەبەری ژیانی تازەی بوو. جا بۆ ئەوەی كاتەكەی بە فیڕۆ نەچێو هەست بە بێكاری نەكات، كەوتە سەر ئەوەی پێڕستێك بە ناوی گشت كتێبەكانی خۆیەوە چێ بكاتو ناونیشانی هەر یەكێكیانی لە پارچە سرێشێكی چكۆلەدا دەنووسیو لە سەمتی جزو بەندەكەدا، دەینا بە پشتی كتێبەكەوە. ئەم كارە بەدەنییە زەحمەتو بێ سوودەی لە موتالاو خوێندنەوە پێ خۆشتر بوو. چونكە كاری یەكهاویو ڕۆتینیو دەستگیرو بێ سوود، ئارامییەكی هزری ئەوتۆی پێدەبەخشی كە ئیدی بیری لە هیچ شتێكی دی نەدەكردەوەو كاتەكەشی بەلەز لێ دەڕۆیی. تەنانەت ئەوەشی پێ خۆش بوو كە بچێت بۆ مووبەقەكەو دەگەڵ داریوشكادا دانیشێتو پەتاتە پاك بكات یان مرۆر لە ساوار ببژێرێت. ڕۆژانی شەممەو یەك شەممە دەچوو بۆ كڵێسا، لەوێندەر پشتی بە دیوارەكەوە دەداو چاوانی دەنوقاندو گوێی بۆ ئاوازی سروودی ئاینی دەگرتو بیری لە باوك، دایك، زانكۆو ئۆلو ئاینە جۆراو جۆرەكان دەكردەوەو لە كانگای دڵەوە هەستی بە جۆرە ئارامییەكی خەمناك دەكرد، كە لە كڵێساش وەدەردەكەوت، هەمیشە خەفەتی ئەوەی دەخوارد كە بۆچی نوێژو نزاو ڕێوڕەسمەكە وا زوو تەواو بووە.

لەم ماوەیەدا دوو جاران چوو بۆ نەخۆشخانەكە تا ئیڤان دمتریچ بدینێو دەمەتەقەیەكی دەگەڵ بكات، بەڵام هەردوو جارەكە ئیڤانی بە پەشێویو پەریشانیو توڕەیی بینی، تكای دەكرد كە بە تەنێ بەجێی بێڵنو دەیگوت: دەمێكە لە خەڵكانی بودەڵەو هیچو پوچ، لە چەنەبازی بێهودەو بازاڕی بێزار بووە، دەیگوت لە هەنبەر ئەو هەموو ڕەنجەی داویەتی هیچ پاداشتێكی لەو خەڵكە هیچو پوچە ناوێ، تەنیا ئەوە نەبێ كە بیخەنە زندانی ئینفرادییەوە، بەڵام دەترسا ئەو داوا بچووكەشی پێ ڕەوا نەبینن!. هەردوو جارەكە، كە دكتۆری پیر، لە كاتی ڕۆییشتنا خودا حافیزیو شەوباشی لێكرد، ئیڤان دمتریچ، زۆر بە ڕەقی وەڵامی دایەوە.

– دەڕۆی بە جەهەنەم!

بۆیە ئاندریێ یفیمیچ، دوو دڵ بوو لەوەی کە بۆ جاری سێیەم بچێتە سەردانی یان نا؟ – هەڵبەتە بە دڵ حەزی دەکرد ئەم دیدارە تازە بکاتەوە.

ئاندریێ یفیمیچ، جاران عادەتی وابوو دوای فراڤین، بە ژوورەکەیدا پیاسەی دەکردو بە دەم پیاسەوە لە فکران ڕادەچوو، بەڵام هەنووکە لە نیوەڕۆوە تا عەسر لەسەر کەتەکەی ڕادەکشاو رووی دەکردە دیوارەکەو لە دەریای هزرو بیری پوچ و بێ سەمەردا نقوم دەبوو، و هەرچی دەکردو دەکۆشا نەیدەتوانی ئەو بیرانە لە مێشك و خەیاڵی خۆی بتارێنێ. زۆری خەفەت بەوە دەخوارد کە دوای پتر لە بیست ساڵ خزمەت، نە موچەیەکی خانەنشینیان بۆ بڕی بووەوەو نە پاداشتێکیان دابوویە، ئەم کارەی بە سووکایەتیەکی گەورە دەزانی. ڕاستە خۆی بەوە نەدەزانی کە لە کارەکەیدا پاك و دروستکار بووبێ، بەڵام مووچەی خانەنشینی بە هەر کارمەندێك دەدرا کە ماوەیەکی لەکارو خزمەتدا بەسەر بردبا، ئیدی ئەو کارو خزمەتەی بە پاکی و دڵسۆزی کردبا، یان بە ناپاکی و نا دڵسۆزی. یاساو ڕێساو دادپەروەری جڤاکی ڕۆژگاری ئێمە وادەخوازێت کە پایەو میداڵ و نیشان و مووچەی خانەنشینی، لە هەنبەر خزمەتی کارمەندا، ئیدی هەر جۆرە خزمەتێك بێ، چاك یان خراپ، بدرێت، نەك لەسەر تایبەتمەندی ئەخلاقی و تواناو بەهرەو دڵسۆزی ئەو کارمەندە، باشە بۆچی تەنیا ئەویان لەم یاساو ڕێسایە پەڕاندووە؟

ئاندریێ یفیمیچ تاقە پولێکی پێ نەما بوو، شەرمی دەکرد بەبەر دوکانەکاندا تێپەڕێت و تەمەشای دوکاندارەکان بکات، هەر قەرزی بیرەی گەیی بووە سی و دوو ڕۆبڵ. هەڵبەتە قەرزاری خاوەن ماڵەکەش بوو. داریوشکا لە بەرەوەو، بە دزی دکتۆرەوە جلە کۆنەکانی و کتێبەکانی دەفرۆشت و بە درۆ بە خاوەن ماڵەکەی دەگوت کە دکتۆر بەو زووانە پارەیەکی مۆڵی بۆ دێت.

ئاندریێ یفیمیچ، خەفەتی لەوە دەخوارد بۆچی لەم سەفەرەی دواییەدا، ئەو هەزار ڕۆبڵەی کە بە زەحمەتێکی زۆر پاشەکەوتی کردبوو، بەخوت و خۆڕایی خەرج کردووە، ئەگەر هەنووکە ئەو پارەیەی مابا، چ خەمی بوو! چ گرێ گوێرەیەکی بۆ نەدەکردەوە! زیاتر لەوە پەست و ناڕەحەت بوو کە خەڵکی وازیان لێنەدەهێنا بۆ خۆی دڵرەحەت و ئاسوودە خەیاڵ بژی. دکتۆر خوبوتوف، بە ئەرکی خۆی دەزانی ناو بە ناو سەری هاوکارە نەخۆشەکەی بدات. ئاندریێ یفیمیچ ڕقی لە پێستی سەری بوو، ڕقی لە هەموو شتێکی بوو، لە دەموچاوە گۆشتنەکەی، لە دەنگە ناسازگارو غروورئامێزەکەی، لە ڕەفتاری ریابازانەی، لە وشەی (هاوکار) کە دەرهەق بەو بەکاری دەبرد، لە پوتە درێژەکانی پێی، لەمانەش زیاتر ڕقی لەوە بوو کە خوبوتوف بە ئەرکی خۆیی دەزانی کە معایەنەو دەرمانی ئاندریێ یفیمیچ بکات و وای وێنا دەکرد کە بەڕاستی دەرمان و چارەسەری دەکات. هەر کەرەتێ کە دەچوو بۆ دیدەنی، شووشەیەکی پڕ لە پرومیدی پوتاسیوم و پاکەتێ حەبی دیکەی بۆ دەبرد.

هەروەها میخاییل ئاڤریانیچش بە ئەرکی خۆی دەزانی بچێتە دیدەنی هاوڕێکەی و سەرگەرمی بکات و نەیەڵێ بێتاقەت بێت. هەرجارێ کە خۆی بە ژوورەکەی ئاندریێ یفیمیچدا دەکرد، بە درۆ بە ڕوویەوە پێدەکەنی و دەیویست قەناعەت بە دکتۆری پیر بێنێ و دڵنیای بکات کە بەڕەنگ و ڕوویا، ئەمڕۆکە لە دوێنێ باشترەو شوکر نەخۆشییەکەی روو لە باشییە. بەڵام تۆنی دەنگی

ئەوەی دەنواند کە بە تەواوەتی لە وەزعو حاڵی دۆستەکەی نائومێدو هیوا بڕاوە. هێشتا ئەو پارەیەی نەدابووەوە کە لە وارشۆ لێی قەرزکردبوو، بۆیە هەر کاتێ (ئاندرێ یفیمیچ)ی دەبینی هەستی بە تەریق بوونەوەو شەرمەزاری دەکرد، جا بۆ شاردنەوەی ئەمە هەوڵی دەدا بە دەنگی بەرزتر قاقا لێبدات و نوکتەو چیرۆکی کۆمیدیتر بگێڕێتەوە، نوکتەو چیرۆکەکانی کۆتاییان نەبوو، بەڵام ئیدی ئەو نوکتەو چیرۆکانەی کە دەیگێڕانەوە، نە لەلای ئاندرێ یفیمیچ تامو لەزەتیان مابوو نە لەلای خۆی، زۆر ڕۆتینی و یەکهاوی و سواو دەهاتنە بەرچاو.

ئاندرێ یفیمیچ، هەرکە هاوڕێکەی دەهات بۆ لای، لەسەر تەختە خەوەکەی ڕادەکشا، ڕووی دەکردە دیوارەکەو بە دەم دان جیڕکردنەوە گوێی دەگرت، هەستی دەکرد خەمو پەژارەیەکی نا ئاسایی لەسەر دڵیا کەڵەکە دەبوو و، لە گەڵ هەر هاتنێکی میخاییل ئاڤریانیچدا بۆ لای، ئەم خەمو پەژارەیە ڕوو لەزیادی دەڕۆیی و لەزگ بوو ئەوکی بگرێت و خەفەی بکات.

بەو ئومێدەی ئەم هرزو هەستە پوچ و بێهودانە لە خۆیدا خەفە بکات، لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە کە هەم خوبوتوف، هەم میخاییل ئاڤریانیچ و هەم خودی خۆی، بیانەوێ و نەیانەوێ، درەنگ یان زوو دەبێ بارگەی ژیان تێکبنەن و بەرەو مەنزڵی مەرگ بڕۆن، بەبێ ئەوەی لەم دنیایەدا شوێنەوارێك لە دوای خۆ بە جێ بێڵن، ئەگەر بە خەیاڵ و لە جیهانی خەیاڵدا وێنای ئەوە بکەین کە دوای یەك ملیۆن ساڵی دیکە، روحێکی سەرگەردان لە ئاسمانی بێ کەوشەن و سنوورەوە بەسەر گۆی زەویدا بسووڕێتەوە، بێگومان جگە لە خاکی ساردو، هەڵدێران و، تات و تاوێران و، بیابانی رووتەن و چۆڵ وهۆڵ هیچی دی نابینێ. کەواتە ئەم شەرمەزاری و خەجاڵەتبارییە لە هەنبەر یارۆی دوکاندارو ئەم ناڕەحەتیە کە خوبوتوف هیچ و پوچ و بودەڵەو، ئەم دۆستایەتیە پڕ عەزابەی میخاییل ئاڤریانیچ لە پای چی؟ هەر هەموو ئەمانە پوچ و بۆش و بەتاڵە.

بەڵام ئەم جۆرە هزرین و ئەم چەشنە داوەرییەش فایدەی نەبوو، چونکە هەرکە بە خەیاڵ، گۆی زەوی پاش یەك ملیۆن ساڵی دی دێنایە بەرچاوی خۆی، یەکسەر سەروسەکوتی خوبوتوف، بە پوتە درێژەکانییەوە، لە پاڵ تاوێرێکی وشك و برینگدا لەبەر چاویا بەرجەستە دەبوو، یان قەدو قەڵافەتی میخاییل ئاڤریانیچ، بە قاقای پێکەنینەکەیەوە لە پشت تاوێرێکەوە دەردەکەوت و گوێی لێی دەبوو کە بە دەنگێکی نەرمو پچڕ پچڕو، شەرەمەزاری و خەجاڵەتبارییەکی زۆرەوە دەیگوت: "گیانەکەم، خەمت نەبێ، لەم ڕۆژانەدا ئەو قەرزەت، کە لە وارشۆ لێم کردبوویت دەدەمەوە.... دڵنیا بە دەتدەمەوە."

((١٦))

ڕۆژێك دەمەو عەسر بوو، ئاندرێ یفیمیچ لە سەر قەنەفەکە ڕاکشا بوو، میخاییل ئاڤریانیچ خۆی بە ژوورا کرد. بە رێکەوت (خوبوتوف)ش لە هەمان وەختا، بەخۆو شووشەیەك پرۆمیدی پۆتاسیومەوە خۆی بە ژوورا کرد. ئاندرێ یفیمیچ، بە زەحمەتێکی زۆر، خۆی راستکردەوەو لەسەر قەنەفەکە دانیشت و هەردوو دەستی خستنە سەر پشتی قەنەفەکە. میخاییل ئاڤریانیچ سەری قسەی کردەوەو گوتی:

– گیانەکەم، ئەمڕۆ ڕەنگ‌و ڕووت زۆر باشترە لە دوێنێ. گەنج بوویتەوە. خودایە چەند گەنج بوویتەوە!

(خوبوتوف)ش بە دەم باوێشك دانەوە گوتی:

– هاوکاری ئازیز، ئیدی کاتی ئەوە هاتووە چاك ببیتەوە، بێگومان خۆتیش لەم وەزع‌و حاڵ‌و گۆشەگیرییە بێزار بوویت!

میخاییل ئاڤریانیچ، بە خۆشی‌و شادییەوە گوتی:

– ئەرێ، چاك دەبێتەوە! سەد ساڵی دیکە دەژی!

خوبوتوف، وەکو ئەوەی بیەوێ دڵخۆشی کەسێك بداتەوەو ورەی بەرز بکاتەوە، گوتی:

– بۆ سەد ساڵ نازانم، سەد ساڵ زۆرە، بەڵام بەلای کەمەوە بەشی بیست ساڵی پێوە ماوە. هاوکاری ئازیزم! هیچ نییە! گوێ مەدەیە، پێویست ناکات ورە بەربدەی.... هیچ خەمت نەبێ... ئیدی واز لەم گۆشەگیرییە بێنە.

میخاییل ئاڤریانیچ بەدەم قاقای پێکەنینەوە ،دەستی نایە سەر ئەژنۆی هاوڕێکەی و گوتی:

– من‌و دکتۆر تازە هەوەڵمانە، بزانە چۆن هاوینی داهاتوو، ئیشەللا بە دوو قۆڵی سەفەری قەفقاز دەکەین‌و لەوێندەر هەموو رۆژێ ئەسپ سواری دەکەین... هۆپ، هۆپ، هۆپ... هەموو ئەو دەڤەرە تەی دەکەین‌و، کە لەوێش گەڕاینەوە، کێ چوزانێ؟ لەوەیە زەماوەند بکەین.

بە دەم ئەو قسەیەوە چاوێکی داگرت‌و لەسەری رۆیی:

– ژنت بۆ دێنین دۆستی ئازیز!... دەتکەین بە زاوا.

ئاندرێ یفیمیچ، لە ناکاو هەستی کرد بەو قسەیە سەرو دڵی گیرا، هەناسەی تەنگ بوو، دڵی کەوتە پرتە پرت، لە پڕ و بەلەز لە جێی خۆی هەستا، بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیی‌و گوتی:

– قسەی قۆڕو بێ مانا! یانی ئێوە بە خۆتان نازانن چ ناماقوولییەك دەکەن؟

دەیویست بە نەرمی و بە نەزاکەتەوە لەسەر قسەکانی بڕوات، بەڵام بە دەستی خۆی نەبوو، کۆڵەمستی گوشی‌و بەرزی کردەوە، لە کاتێکدا لە داخا سوور بوو بووەوەو لە حەژمەتاندا دەلەرزی، بە دەنگێکی نائاسایی‌و گیراو گوتی:

– وازم لێ بێنن! بۆ دەرەوە! هەردووکتان بۆ دەرەوە!

میخاییل ئاڤریانیچ‌و خوبوتوف، بە هەشتاو هەستانە سەر پێیان‌و هەوەڵجار بە حیرەت‌و سەرسامی‌و پاشان بە ترسەوە لێیان ڕوانی، بەڵام ئاندرێ یفیمیچ پەیتا پەیتا هاواری دەکرد:

– هەردووکتان بۆ دەرەوە! بەڕاستی خەڵکێکی کەرو گەوجن! نە ئاتاجی دۆستایەتی تۆم‌و نە دەواو دەرمانی تۆی گەوج‌و کەودەن! بەڕاستی خەڵکێکی گەوج‌و کەرن، بەڕاستی چەورەن، خوێڕیەتیش بەم ڕادەیە!

خوبوتوف‌و میخاییل ئاڤریانیچ، پەشێوو پەریشان، مودەتێك ڕوانیانە یەکدی، پاشان بەلەز لە دەرگای ژوورەکە وەدەرکەوتن‌و خۆیان گەیاندە ڕاڕەوەکە. ئاندرێ یفیمیچ هەر پڕی دایە شووشە پڕومید پۆتاسیومەکەو تێی سرەواندن، شووشەکە شڵپ کەوت بە لا شیپانەی دەرگاکەداو وردو

خاش بوو، هەنگێ بەرەو ڕاڕەوەك تەكانی داو، لە كاتێكدا توڕەیی‌و گریان ئەوكیان گرتبوو، دیسان هاواری كرد:

– بڕۆن، حەوت بەرد لە شوێنتان!.... بڕۆن، بەر نەكەن بە دواوە!

پاش ڕۆییشتنی میوانەكان، وەكو یەكێك لەرزی لێهاتبێ، بە پەلە چوو لەسەر قەنەفەكە پاڵ كەوت‌و، لێكدا لێكدا دەیگوت‌و دەیگوتەوە:

– هیچ‌و پوچ‌و، ئەحمەقینە! كەرینە!

لێ هەركە هێور بووەوە، لە دڵی خۆیدا ژێوان بووەوەو بیری لەوە دەكردەوە كە ڕەنگە هەنوكە (میخاییل ئاڤریانیچ)ی داماو، زۆر تەریق و خەجاڵەت بێ، ئەمەی زۆر لەبەر گران‌و ناخۆش بوو. پێشتر هەرگیز شتی وا ڕووی نەدابوو. ئەدی ئەقل‌و نەزاكەتەكەی كێوە چوو بوو؟ حیكمیەت‌و خوێناساردییە فەلسەفیەكەی لە كوێ بوو؟

دكتۆر، ئەو شەوە تاكو بەیانی، لە تەریقی‌و شەرمەزاریدا، خەو نەچووە چاوانی. بەیانی لە خەو ڕابوو، دەوروبەری سەعات دە چوو بۆ پۆستەخانە تا عوزرخوازی لە میخاییل ئاڤریانیچی دۆستی بكات. میخاییل ئاڤریانیچ، كە داخ‌و كەسەر بە ڕوویەوە دیاربوو، بەوپەڕی گەرم‌و گوڕی دەستەكانی گوشی‌و ئاهێكی قووڵی هەڵكێشاو گوتی:

– ئەوەی چوو چوو، باسی مەكە.

بەڵام لە ناكاو، بە دەنگێك كە هەموو كارمەندان‌و موراجیعەكانی هێنایە لەرزە، هاواری كرد:

– لیوباوكین! كورسییەك بێنە!

ئەوسا، بەسەر پیرەژنە دێهاتییەكدا، كە دەیویست لە بەینی شیشبەندی موحەجەرە ئاسنەكەوە، نامەیەكی سڤارشتی بداتێ، نەڕاندی و گوتی:

– سەبرت بێ پیرەژن! مەگەر نابینی كە سەرقاڵم ؟

دوای ئەم هات‌و هاوارانە، دووبارە ڕووی كردەوە دكتۆرو بەوپەڕی نەرمی‌و نەرمكێشییەوە گوتی:

– ئا، ئەوەی چوو چوو، با لە بیری بكەین! دۆستی ئازیزم تكا دەكەم كەرەمكە دانیشە!

دوای ساتێك بێدەنگی، دەستی بەسەری ئەژنۆكانی خۆیدا هێناو گوتی:

– باوەڕ بكە بە خەیاڵیش زویر نیم، دەزانم كە نەخۆشی گاڵتە نییە. باوەڕبكە هەڵچوون‌و توڕە بوونەكەی دوێ شەوت هەم من‌و هەم دكتۆریشی ترساند، تا ماوەیەكی زۆر لەوە دواش هەر باسمان كردوویت. برادەری ئازیز بۆچی حەزناكەیت نەخۆشیەكەت بە تەواوەتی‌و بە جددی چارەسەر بكەن؟ ئاخر ژیان بەو جۆرە دەگوزەرێ؟

ئەوسا، دەنگی نزم كردو لە بن لێوانەوە گوتی:

– ببورە كە من لە ڕووی دۆستایەتیەوە بە ڕاشكاوی قسان دەكەم، هەر بەینی خۆمان بێ ئەوە ژیان نییە كە تۆی تیای. شوێنەكەت تەنگ‌و بچووكە، پیسە، كەسێك نییە خزمەت و پەرستاریت بكات، چاوی تێتەوە بێ‌و خزمەتێكت بكات، ئاخر لەو وەزع‌و حاڵەدا چارەسەری تۆ مەحاڵە... برادەری ئازیزم! من‌و دكتۆر خوبوتوف، دڵسۆزانە تكات لێدەكەین كە بە گوێمان بكەیت‌و بچیت

له نەخۆشخانه بخەوی! خواردنی ئەوێندەر باش‌و خاوێنه، باشتر پەرستاریت دەکەن‌و هەر چەنده یفگینی فیدوروفیچ، بنیادەمێکی عەبوس‌و گۆساخ و بیٚ ئەدەبە، بەڵام بەینی خۆمان بێت، دکتۆرێکی به ئەزموون‌و شارەزایەو متمانەی پێدەکرێت. بەڵێنی به من داوه که چارەسەرت بکات.

غەمخۆری ڕاستگۆیانەو ئەو چەند دڵۆپه فرمێسکەی که لەپڕ به گۆنای سەرۆکی پۆستەخانەوه هاتنه خواریٚ، کارێکی زۆریان له ئاندریٚ یفیمیچ کرد، دەستی خسته سەر دڵی خۆی‌و زۆر بەنەرمی‌و هێوری گوتی:

– دۆستی ئازیزم! باوەڕ به قسەکانی دکتۆر مەکه! به هیچ کلۆجیٚ باوەڕی پیٚ مەکه، دەیەویٚ تۆ بخەڵەتێنیٚ، پیاوێکی دەغووڵ‌و فریبۆکه. نەخۆشییەکەی من تەنیا ئەمەیه که بیست دانه ساڵه لەم شارەدا دەژیم، دوای ئەم هەموو ساڵه، تەنیا یەك پیاوی زیرەك‌و ئاقڵم پەیدا کردووه، که ئەویش شێته. ئەمەیه نەخۆشییەکەی من، جگه لەمه هیچ نەخۆشییەکی ترم نییه، به کورتیەکەی کەوتوومەته ناو بازنەیەکی بۆش‌و به تاڵەوەو ڕێگەی دەرباز بوون نا دۆزمەوه. به هەرحاڵ ئیدی بۆ من هیچ فەرقێك ناکات، تۆ هەرچییەك بڵێی به گوێت دەکەم.

– برادەری ئازیزم، کەواته برۆ له نەخۆشخانه بکەوەو لەویٚ ئیسراحەت بکه.

– بۆ من هیچ فەرقێك ناکات، بۆ هەر گۆڕێك بڵێی دەڕۆم.

– گیانەکەم، بەڵام قەولم بدەیه که یفگینی فیدوروفیچ هەرچییەکی گوت به گوێی دەکەی.

– بەڵێن دەدەم، بەڵام دووپاتی دەکەمەوه که من نەخۆش نیم، بەڵکو خراومەته بازنەیەکی سیحرئامێزی ئەوتۆوه، که تەنانەت هاودەردی ڕاستگۆیانەی دۆستەکانیشم بەرەو نەمانم دەبات. من بەرەو نەمان دەچم، لەم دنیایه دەڕۆم، بەڵام شەهامەت‌و پیاوەتی ئەوەم تیایه که دان بەم مەسەلەیەدا بنەم.

– برادەری ئازیز، دڵنیابه که چاك دەبیتەوه.

ئاندریٚ یفیمیچ به توڕەیی گوتی:

– ئەم قسانه بەچی دەچیٚ؟ ئەوەی که هەنووکه من هەستی پێدەکەم، ئەو ئاستەنگەی من تێی کەوتووم، کەم کەس هەیه له ئاخرو ئۆخری ژیانیدا هەستی پێنەکات. کاتیٚ پێت بڵێن گورچیلەت نەخۆشەو خەریکه دەوەستیٚ، دڵت ئاوساوەو دەبیٚ فریای خۆت بکەوی یان پێت بڵێن شێتی و تەنانەت تاوانباریت... به کورتی کاتیٚ خەڵکی له پڕ به تۆوه بیگرن، سوور بزانه کەوتوویته بازنەیەکی سیحرئامێزەوه که هەرگیز ناتوانی لێی دەرباز ببیت. تا زیاتر هەوڵ بدەیت لەو بازنەو ژینگەیه دەربازبیت، پتر له پێچ وپەناکانیا وێڵ‌و گومڕا دەبیت. کەواته باشتر وایه به یەکجارەکی و تەواوەتی مل بدەیته خەت، چونکه هیچ هێزێکی بەشەری ناتوانیٚ ڕزگارت بکات. جا ئەمه ڕەئی و بۆچوونی منه."

کاتیٚ که ئەم جووته دۆسته پێکەوه ئەو قسانەیان دەکرد، موارجیعان له پشت شیشبەندەکانەوه کەڵەکه بوو بوون. ئاندریٚ یفیمیچ بۆ ئەوەی دۆستەکەی لەوه پتر مژول نەکات‌و کاری ئەو خەڵکه دوا نەخات، هەر هەستاو خودا حافیزی له دۆستەکەی کرد. میخاییل ئاڤریانیچ

دووباره قەولی شەرەفی لێوەرگرت کە بچێت لە نەخۆشخانە بکەوێتو، پاشان تا دەرگای دەرەوەی دایەرەکە بەڕێی کرد.

عەسری هەمان ڕۆژ، خوبوتوف بە فەروەو پووتی درێژەوە، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، هاتە دیدەنی ئاندرێ یفیمیچو بەدەنگو سەدایەك وەکو ئەوەی دوێ شەو هیچ شتێك نەبووبێ، گوتی:

– هاوکاری ئازیز، هاتووم داوایەکم لە خزمەتت هەیە. هاتووم بۆ کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاری پزیشکی دەعوەتت بکەم. نازانم ئاخۆ دەعوەتەکەم قەبوڵ دەکەیت؟ ئایا حەزدەکەی بەشداری تیا بکەیت؟

ئاندرێ یفیمیچ، بەو خەیاڵەی کە خوبوتوف دەیەوێ بۆ گەڕانی ببات، یا ڕەگە راست بکاتو پێویستی بە ڕاوێژو کۆمەکی ئەو هەبێت،و بیەوێ دکتۆری پیر سووکە دەرامەتێکی دەست بکەوێ، بەلەز خۆی گۆڕیو دەگەڵ ئەودا لە ماڵ وەدەرکەوت. زۆر شادو خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو، چونکە وای وێنا دەکرد کە دەرفەتێکی باشی بۆ ڕەخساوە، تا پۆزش بۆ ئەو کارە دزێوەی دوێنێ شەوی خوێ بێنێتەوەو داوای بوردن لە هاوکارەکەی خۆی بکاتو ئاشتی بکاتەوە. لە دڵی خۆیدا سوپاسی خوبوتوفی دەکرد کە تەنانەت ئاماژەیەکی چکۆلەشی بۆ ئەو ڕووداوەی دوێنێ شەو نەکرد، وادیار بوو فەرامۆشی کردبوو و لە دڵی نەگرتبوو، ئاخر چاوەڕوانی ئەم هەموو نەزاکەتەی لە کەسێکی بێ تەربێتی نا ڕۆشنبیر نەدەکرد.

ئاندرێ یفیمیچ، لە ڕێگا پرسی:

– نەخۆشەکەتان لە کوێیە؟

– لە خەستەخانەیە... ماوەیەکە بە نیازبووم پیشانتی بدەم... حاڵەتێکی زۆر غەریبو سەرنجراکێشە.

بە جووت خۆیان بە حەساری نەخۆشخانەکەدا کرد، بە دەوری بینا ئەسڵیەکەدا سوڕوانەوەو بەرەو بەشی تایبەتی شێتەکان ڕۆییشتن، بە درێژایی ئەم ماوەیە لەبەر هەر هۆیەك بوو، ورتە لە کەسیانەوە نەهات. هەرکە خۆیان بەو بینایەدا کرد، نیکیتا وەکو هەمیشە بەرزە پێ لە بەریان هەستا.

کە چوونە ژوورەوە خوبوتوف*، بە ئەسپایی بە (ئاندرێ یفیمیچ)ی گوت:

– سیپەلاکی یەکێك لەمانە ئاوساوە، تۆ لێرە بوەستە تا ئێستا دێمەوە. دەچم سەماعەکەت بۆ دێنم.

ئەو قسەیەی گوتو لە بینایەکە وەدەرکەوت.

****– خوبوتوف: بە زمانی روسی مانای( خەرتوومی فیل) دەگەیەنێت.***

دەمەو ئێوارە بوو، دنیا ڕوو لە تاریك بوون دەچوو! ئیڤان دمتریچ، لەسەر تەختە خەوەکەی خۆی ڕاکشا بوو و سەروچاوی لە بالیفەکەی چەقاندبوو، پیرەمێرە ئیفلیجەکە بێ جووڵە لە جێی خۆی ڕۆنیشتبوو، هێدی هێدی بەدەم گریانەوە لێوی دەبزواند. بەڵام فەلاحە قەڵەوەکەو، پۆستەبەرەکەی جاران خەوتبوون. بێدەنگی و خامۆشی تەواو باڵی بەسەر قاوشەکەدا کێشا بوو.

ئاندرێ یفیمیچ لە قەراخی تەختە خەوەکەی ئیڤان دمتریچ دانیشتبوو و چاوەڕوانی گەڕانەوەی خوبوتوف بوو. بەڵام دوای نزیکەی نیوە سەعاتێك، لە جیاتی خوبوتوف، نیکیتای دەرگاوانو پاسەوان خۆی بە قاوشەکەدا کرد، جبەیەك و دەستێك کراسو دەرپێو جووتێ سۆلی لە ژێر باخەڵ بوو. هەرکە وەژوور کەوت، بە ئەسپایی و کاوەخۆ گوتی:

— فەرموو، ئەزبەنی ئەمانە لەبەر بکە!.

هەنگێ بە دەست ئاماژەی بۆ تەختە خەوێك، کە دیار بوو تازە بۆ قاوشەکەیان هێنا بوو، کردو گوتی:

— ئەمەش جێگەی تۆیە، فەرموو بچۆ ئەوێ، خەفەت مەخۆ، ئیشەڵلا خودا شیفات دەدات.

ئاندرێ یفیمیچ، پەی بە هەموو شتێك برد، لێ بێئەوەی وشەیەکی لە زار بێتە دەر چوو بۆ لای ئەو تەختە خەوەی کە نیکیتا نیشانی دابوو و، لەسەری دانیشت، بەڵام کە دیتی نیکیتا وەستاوەو چاوەڕوانی ئەوە، لە جێی خۆی هەستا، جلەکانی خۆی داکەندو سەراپا ڕووت بووەوە. کە خۆی بەو ڕووتیە لە بەردەم نیکیتادا بینییەوە، زۆر بە خۆیدا شکایەوە. ئەوسا جلکی نەخۆشخانەی لەبەر کرد. دەرپێیەکەی زۆر کورت و کراسەکەی زۆر درێژ بوو، باڵا پۆشەکەشی بۆ دڕی ماسی بۆدراوی لێدەهات.

دیسان نیکیتا گوتی:

— ئیشەڵلا بەو زووانە چاك دەبیتەوە.

دوای ئەو قسەیە، جلەکانی (ئاندرێ یفیمیچ)ی نایە ژێر باڵو لە قاوشەکە وەدەرکەوتو دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە داخست.

ئاندرێ یفیمیچ، باڵاپۆشەکەی لە خۆیەوە پێچا، بەو جلانەوە خۆی وەکو بابایەکی زندانی دەهاتە بەرچاو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "چ قەیدییە! هەمووی هەر یەکە، چ جلی فەرمی، چ ئەم جلانە، هەمووی هەر یەکە...."

ئەدی سەعاتەکەی کوا؟ ئەدی ئەو دەفتەرچەیەی کە لە بەڕکی بەرباخەڵەکەی دانا بوو و وردە یاداشتەکانی تیا دەنووسییەوە چی بەسەر هات؟ ئەدی قوتووە سیغارەکەی کوا؟ نیکیتا جلەکانی بۆکوێ برد بوو؟ لەوەیە جارێکی دی بە عەمراتی نەتوانێ چاکەتو پانتۆڵو ئێلەكو پێڵاوەکانی خۆی لەبەر بکات.

هەموو ئەم ڕووداوانەی، لە سەرەتاوە بەلاوە نەك هەر سەیربوو، بەڵکو نامەفهوومیش بوو. ئاندرێ یفیمیچ هێشتا قەناعەتی وابوو کە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ماڵەکەی بیلوڤیای بێوەژنو قاوشی ژمارە شەشدا نییە، چونکە جیهانو هەموو شتێکی ئەم جیهانەی بە پوچو بێ مانا دەزانی. کەچی وێڕای ئەمەش دەستەکانی دەلەرزین، لاقەکانی ڕچی بوونو نیگەرانی ئەوە بوو

